-6-

ئا ئەو کچە
ئەوەندە قەسیدەی منی
خوێندۆتەوەو لە بەرێتی
لەگەڵ هەر کەسێکدا بدوێ
کەم هەتا زۆر
هەر چۆلەکەی شیعری منەو
هەر پەپوولەی ناو دەوەنمەو
هەر خاڵخاڵۆکەی وشەمەو
لە زاری جوانی ئەوەوە
دێنە دەرێ!.

-7-

با بزانی
گەر مانگ لە تۆ
جوانتر بوایە
قەت حەزم لێنەئەکردی!.
گەر مۆسیقا
دەنگی لە تۆ خۆشتر بوایە
هەرگیز گوێم لێنەئەگرتی.
گەر تاڤگە بەژنی لە تۆ
ناسکترو ڕێکتر بوایە.

قەت تەماشام نەئەکردی.
ئەگەر باخچە بۆنی لە تۆ
خۆشتر بوایە
هەرگیز بۆنم نەئەکردی.
گەر بۆ شیعریش لێم ئەپرسی
با بزانی
گەر تەواو لە تۆ نەچوایە
نەمئەنووسی!

-8-

ئەو ئاوە خاو، دڵۆپ دڵۆپ
ئەتکێتە سەر، ئەو دەوەنە.
ئەو (با)یە خاو، نەرم نەرم
ئەیدا لەو گوڵی خەرمەنە.
ئەو تیشکە خاو، وردە وردە
ئەگاتە ناو ئەو دەربەنە.

که تۆ هاتی
هەرچی جوانیی ناو سروشتە
لە پرێکدا خاوبوونەوە
کە سەیریان کرد:
قژی خاوت سێبەرێکە
لە دوولاوە بە ئەسپایی
ئەچێتە سەر خۆرەتاوی
ئەو دووچاوە!

-9-

«نیان»ی؟
واتە ئاو، پەڕەی گوڵ، کزەی باو
پەپووڵەت تێدایە!.
بمگەڕێ
لەو دەمە قومێکو
لەو لێوە گوڵێکو
لەو سنگە شەماڵێو
بۆ شیعری تازەیشم
پەپوولەی ناو قژتم بدەرێ!.

-10-

من گۆمێکم
نیوەی ئاوم
لە خۆشەویستیی بەفرەوە بۆ هاتووە
ساڵ هەیە زۆر
ساڵ هەیە کەم.
نیوەکەی ترم لە چاوی
ژنەکانی ئەنفالەوە تێ ئەڕژێ
ئەم ئاوەیان
کەم ناکات و
هەموو ساڵێ
سێڵاوێکی تازەترم
ئەکاتە سەر!

-11-

که ترس پەلاماری دام
خۆم بە تیشکێکدا هەڵواسی.
هێندەی نەبرد
باهۆزێ خستمیە خوارەوەو
کەوتمە دەریاچەی شیعرەوەو
لە دواییدا
بووم بە ماسی!.

-12-

تۆ بەم لەچکە
ڕێی هێلانەی
شیعرت لێبەستووم.
من ئەمەوێ
لە دوای فڕین
لەناویا بنووم.
بیکەرەوەو
ئازادی کە
ڕەنگی یەزدانیی.
بۆ ئەیکوژیو
ئەیخنکێنی
شەپۆلی جوانیی؟!

-13-

بە بەر بارانێکدا ئەچووم
بۆ لای یاری چاوەڕوانم
ئەوەی گڕێ بوو لە دڵما
هەرچی دیاری بوو پێم نەبوو
تا بۆی بەرم.
جگە لە قژە سەرێکی
ناو گوڵدانی شانو ملی
خاڵیو بەتاڵ.

باران بەردەوام لێی ئەدام.
وەختێ گەیشتمە بەردەمی
تاڵە قژی سەر رسکا بوون
هەر لەوێدا
دەستم بردو چوار پێنج گوڵم
لە باخچەی سەرم کردەوەو
دامە دەستی!.

-14-

ئەو ساتانەی
لە تەکتا بم
ساڵم ئەچێتەوە دواوەو
وا هەست ئەکەم
باڵندەکەی یەکەم جاری
ناو ئاسمانی سەر «ئەزمڕ»م
چۆنم بوێ ئاوا ئەفڕم.
ئەو ساتانەیش کە دووری لێم

وا هەستم ئەکەم
زەمانۆ زۆر تیژ تێئەپەڕێو
باڵندەیەکم پیر بووم‌و
باڵم قورس‌و
هەرچەند ئەکەم
بەرەو سەرێ
بستێ نافڕم!

-15-

من ئەمەوێ
بۆ حەوت ڕۆژی ئەم هەفتەیە
لە شەممەوە هەتا شەممە
هەتاکو یادی زیوینی
جەژنی لەدایکبوونی تۆ.
هەموو ڕۆژێ
شیعرێ بکەم بە «شتێك» و
دیارییەکی دەم بەخەندەو
پێشکەشتی کەم!.
لە شەممەدا ڕستێ لە وشەی بۆنخۆشم
ئەکەم بە یەك مێخەکبەندی تازە.

بۆ یەکشەممە
پەخشانێك ئەکەم بە ڕەفتە.
بۆ دووشەممە
دوو هۆنراوەی پیرۆزەیی
ئێجگار کورتم
ئەکەم بە جووتێ بازن‌و
بۆ سێشەممە
قەسیدەیەکی درێژم
ئەکەم بە کراسێکی سووری ئاودامان.
بۆ چوارشەممە
دوو دێڕی زۆر ئاهەنگدارم

ئەکەم بە جووتێ پاوانە.
بۆ پێنج شەممە
دوو کۆپلەی پێکەوەنووساوی شیعرم
ئەکەم بە ستیانی شینی ئەو مەمانە.
لە هەینیشدا
چی فاریزەو خاڵی ناو نووسینەکانمە
ئەیانکەم بە متو موورو بە پوولەکەو بە زەنگیانە.
بۆ دواشەممەیش
ئەوسا بۆ خۆم دێم بۆ لاتو
ڕۆحم ئەکەم بە مۆمی بیستو نۆهەمو
لەگەڵ ماچێکی شەرابیی ئەو دەمەدا
لەسەر مێز دائەگیرسێنم!

سلەیمانی
کانوونی دووەمو شوباتی 2010

تەریبی رۆژگاری دوێنێ
بە سێبەرو هەتاوەوە
بە فرمێسكو زەردەخەنەو
بە تاریكیو بە چراوە
ئەگەڕێنەوە بۆ ئیستاو
لەگەڵیاندا جوانووی سپی درامایەك
پێ ئەخاتە ناو دنیاوە
ئەوەتەی ژیان ژیانە
ئەوەتەی ئینسان ئینسانە
عەشق ئەیەوێ وەك «ڕەزا» و
وەكو «گوڵێ»

بە پەپوولەو بە خونچەوە
بێن بۆ لامان
غەدریش ئەیەوێ وەك «میرزا»
بە پەیکوڵی ئەشکەنجەوە
بارانو گوڵو ئەوینمان
تیا بکوژێ!
ئەم درامایە ڕووبارە
بە ئاوی لێڵو ڕوونەوە
بە شەپۆلی تێکئالاوو
بە هاژەهاژی هەڵچوونو
بە خەمۆکی داچوونەوە .

ئەم تەریبانە پرشنگن
جارێك ئەبنە پلیكانە بۆ ئاوات و
جارێكی دی تەم و مژن و
لە بێزاریدا نوقمن
لەگەڵمان بن وەك هەناسەو
چاوی خۆتان، لەگەڵمان بن
هەموو شەوێ بە یەكەوە
سەرێ لە ئازارێ ئەدەین
بە یەكەوە هەموو شەوێ
ئەستێرەیەك بۆ عاشقان
دائەگرین و هەموو شەوێ

هەست و نەست
شێركۆ بێكەس

ئەڵقە ئەڵقە بە یەکەوە
لە خەرمانەی خۆشەویستی
ئەهێنینە ئەمماڵەوە!
ئەم درامایە چیایە
هەڵئەکشێ و دائەکشێ و
جارێك سەری لە هەوردایەو
جارێکی دی درەختێکەو
ڕەگی لە دڵی خەڵکایە!

• ئەم دەقە بۆ درامای ڕۆژگارە تەریبەکان نووسراوە کە لە لایەن هونەرمەند «کامەران ڕەووف»ەوە بۆ تەلەفزیۆن ئامادە کراوە، و دەرهێنراوە ، لەبنەڕەتیشدا دەقەکە لەڕۆمانێکی (غایب توعمە فەرمان)ەوە وەرگیراوە ، بەڵام تانووسینی ئەم پەراوێزە نمایش نەکراوە .

ئەم ڕۆژانە
لە ناوەندام
وەك فوارەیەك لە نێوانی
گوڵەکاندا، چۆن هەڵئەچن
منیش ئاوا
خول ئەخۆم و
بە چوار دەورا
پرژە پرژم
ڕوومەتی سەوز
ڕوومەتی زەرد
ڕوومەتی شین.. ماج ئەکات و

دەم لە کەسیان وەرناگێڕێ!
بۆ هەمووتان
ئاوی شیعرم.
بۆ شەقامتان
بۆنی شیعرم.
بۆ مێژووتان
ڕەنگی شیعرم.
من ناتوانم فوارە بم و
تەنها یەک تەلان ئاو بدەم
من ناتوانم ڕەنگدان بم و
خۆم بۆ یەک ڕەنگ تەرخان بکەم!

«بەڵام ئەگەر ڕەنگێ ویستی
بە ڕەنگی خۆی ڕەنگمان بکاو
دامانپۆشێو
هەموو باخچە بۆ خۆی بەرێو
گوێ لە گەڵاو
گوێ لەو هەموو لقو چڵەو
داروبەردەی ئێرە نەگرێ.
ئەوسا ئیتر منی فوارە
بە لووزەوێ دێمە دەنگو
ئەچمە سەرێو
لە ئاوی شەرمەزاریدا غەرقی ئەکەم!»

ئەمێستاکە
لە ناوەندام
وەك فوارەکان  لە نێوانی
ڕەنگەکاندا چۆن هەڵئەچن.
من لە شینێکی نیللیدا
چەندین گۆمی قوڵم هەیەو
چەندین مۆمی قژ نارنجی‌و
چەندین شەپۆل هاوڕێمن!
من لە سەوزاو من لە زەرددا
چەند نیگای گوڵەبەڕۆژەو
چەند حیللەی ئەسپی خۆم هەیە.

من لە ناو چوار ئەستێرەدا
چەندین خەون و
چەندین پرشنگی خۆم هەیە!
من ناتوانم وەکو ئێوە
دەست بکەمە ملی یەك ڕەنگ
من ناتوانم «لەم ساتەدا»
شمشاڵێك بم بۆ یەك ئاهەنگ.
تۆ ئەتوانی و ئەو ئەتوانێ
بەڵام من بۆیە ناتوانم
چونکە شیعری یەك ڕەنگ نیم و
یەك خەو نیم و

مەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

نیشتمانی هەمووتانم!
من وەمزانی لەو شوێنەدا
هۆنراوەکەم تەواو بووە!
بەڵام سنووقێکی بەتاڵ
یەخەی گرتم
وتی خۆ تۆ هەرچی ڕەنگە
لە دواهەمین وەختی مندا
نایخەیتە ناو هەناومەوە!
وتم لەو چرکەساتەدا
کە لەسەر تۆم
تەنها هەر خۆم

هەر خۆمو خۆم
لەگەڵ تۆدا
بەو نەهێنییە ئەزانین
بە کام ڕێگەی ڕەنگدا ئەڕۆم..

سلەیمانی
2009/7/8

## تابلۆیەك

له چاوەڕوانیی پاسێکدا ڕاوەستاوە
تەندوورەیەکی گوڵ گوڵی و
بلووزێکی کەسکی کاڵی لەبەردایە.
قژی درێژ.. دەمێك ئەچێتە سەرچاوی و
دەمێکی تر هەڵفریوی بەردەم «با» یە .
لەوە زیاتر هەبێ و نەبێ
دەستکردێکی بەکاوەخۆی
بەیانییەکی خودایە!
بەم گەرمایە
چون ڕۆشتنی خەیاڵێکی شەکەتی من
پاسێك بەلەقە لەق هات و
باخچەیەکیشمان خۆی هەڵبڕی و چووە سەرێ و

پاس تێپەڕی و منیش بەتەنها مامەوە !.
چرکەیەك و
وەختێ ئاورم دایەوە:
گوڵەکانی تەندوورەکەی
ڕەنگی کەسکی بلووزەکەی
شنەشنی کزیە درێژو خاوەکەی
لەدوای خۆیان ..
ژێرچەتری پاس و ناوقژم و
ناو هەناوم و هەردوو گیرفانی چاکەتم و
ژووری دڵ و ..بەرهەیوانی هەردوو چاومیان
پڕ کردبوو.

**لەپەڕەی گوڵ ولەگەڵاو**
**لەپەپوولەی سپی سپی و**
**لەمێخەکی شیعری بۆنخۆش !.**

سلێمانی
سەرەتای حوزەیرانی 2010

-1-

دوێنێ قەڵەمێك لە شێوەی کۆترێکدا
بە دەم شەقڕنەوە کوژرا.
دوێنێ کۆترێك لە شێوەی قەڵەمێکدا
بە دەم نووسینەوە کوژرا.
ئاسمان گریاو
وشە گریاو
شەقام گریاو
شیعریش ڕەنگی هەڵبزرکا!.
دوێنێ درەختێ لە شێوەی ڕۆژنامەدا
بە دەم جریوەوە کوژرا.
دوێنێ ڕۆژنامەیەك لە شێوەی درەختدا

به دەم خوێندنەوەوە کوژرا.
وتار پژاو
هەواڵ ڕژاو
ستوون شکاو
خەونیش سەربەرەوخوار کشا!.

ئەمڕۆ باخان، لە مەرگی جۆگەلەیەکدا
هەر هەموویان، پڕۆپۆی ڕەشیان پۆشیوە.
ئەمڕۆ قەڵەم، لە گوێ زامی «سەردەشت»ێکدا
هەر هەموویان، بە سوور هاژەیان نووسیوە.
شار بێڕەنگ و
«با» بێدەنگ و
خوا دڵتەنگ و
تاوانیش بۆ خۆی ڕائەکا!

-2-

ئەو وەختەی درەختێك ئەكوژرێ.. دارستانێك خەم دای
ئەگرێ،
ئەو دەمەی جۆگەیەك ئەكوژرێ.. ڕووبارێك دڵی تەنگ ئەبێ.
ئەو كاتەی ئاسكێ ئەكوژرێ.. دەشتێك پرسە دائەنێ.
ئەو ساتەی شیعرێ ئەكوژرێ.. زمانێك فرمێسك ئەڕێژێ.
بەڵام ئەو دەمەی (سەردەشت)ێ تیرۆر ئەكرێ
دارستانو ڕووبارو دەشتو
زمانی وڵاتێك ڕائەپەڕێ!.

-3-

کە ئەو تافگەیە کوژرا.. من نەم زانیبوو
بەڵام وەختێ سەرنجم دا لەناو باخچەی ماڵەکەمدا
لە ژوورەکەمدا.. لە دیوانی شیعرەکانما
گوڵەباخو پەپوولەو وشەو شنەو
مانگەشەوی خەیاڵێکم
بە یەکەوەو لە بەردەمما
هەر هەموویان دڵیان وەستا!

-4-

خوێنی سەردەشت تەنیا نییە
دارهەناری ئەم وڵاتەی لەگەڵدایە.
سەری سەردەشت تەنیا نییە
پەڵەهەوری ئەم ئاسمانەی لەگەڵدایە.
چاوی سەردەشت تەنیا نییە
کانیەکانی ئەم شاخانەی لەگەڵدایە.
سەردەشت عوسمان خۆی یەکێکە
بەڵام کۆی زامو هاواری
هەموومانی لەگەڵدایە!.

-5-

لە دوای خۆی
ئەو گوڵە سپیانەی بە دەستیەوە بوون
پەڕەپەڕەی، بوون بە کۆترو پەپوولەو
بوون بە کلووی خۆشەویستیی‌و
بوون بە عەشقی شیعری سپی‌و
بوون بە جلی سپی بووک‌و
بوون بە شەکرو بوون بە ئاردو
ئیستا لە هەموو ماڵێکدان

-6-

ئەو رۆژەی سەردەشت دیارنەما
دڵم وتی: هەتاهەتایە من ئیتر نایبینمەوە
بەڵام دڵم هەڵەی کردو
ئەو وەختەی چوومە بەر زانکۆ
هەرچی کورێکم ئەبینی.. هەر سەردەشت بوو
هەرچی کتێبو دەفتەرو قەڵەمێك بوو
کە ئەمبینین
هی سەردەشت بوون..

هەرچی دڵۆپە فرمێسکی چاوی کچ بوو
بۆ سەردەشت بوون..
دڵم هەڵەیەکی زۆر گەورەی کرد
ئەوەتا وا نیشتمان خۆی
بە دارو بەردو ئاوەوە
بۆتە سەردەشت!

-7-

سەردەشت تەنها یەك پەیکەری سپی نابێ
شەقامێ یان گۆڕەپانێ ماچی بکاو
لە گلێنەی خۆیا داینێ!.
هەموو.. هەموو
درەختەکان خۆیان ئەکەن
بە پەیکەری سەوز بۆ ئەو
دارگێلاس و بەلاڵووك و هەنارەکان
خۆیان ئەکەن بە پەیکەری
سەرتاپا سوور بۆ جەستەی ئەو

گوڵەبەڕۆژەو تیشکی خۆر
خۆیان ئەکەن بە پەیکەری
سەرومل زەرد بۆ یادی ئەو
سەردەشت تەنها یەك پەیکەری نابێ
لەناو شیعری سروودێکدا دانرابێ
تۆ بڕوانە لەناو هەزارانِ هەزار دەروونـدا
چۆن وەستاوە گوڵ بەدەستو
ڕوو لە سبەی
پەیکەری ئەو!.

-8-

دەنگی سەردەشت وەك دەنگی (با) و
گۆرانیەکانی شاخو داخ قەت ون نابێ!.
چاوی سەردەشت وەکو چاوی گوڵەهێرۆ
چاوی کانیو نیگای شەقام بزر نابێ
بچن بۆ کوێ ئەو لەوێیە
لە تەیراوا.. بووە بە تەیری ئەوینو
لەسەر قەڵا.. بازێکە رەنگ خۆڵەمێشیو
لە کەرکووکدا.. گەڵاوگوڵی دارلیموۆیەو
لە رێی موسڵێش.. گوڵاڵەیەکی لارێیە.
ڕەنگی سەردەشت چون ڕەنگی پارکی ئازادیو
ڕەنگی وتاری کوژراوو ڕەنگی گۆڕەپانی بەردەم
کۆلیجەکەی.. ناچێتەوە!.

همست و نەست
ستێرکۆ بێکەس

بچن بۆ کوێ ئەو لەوێیە
لەناو پۆلدا کتێبێکی کراوەیەو
پەنجەرەیەکی والآیەو چاویلکەکەی مامۆستایەو
لەناو قژی کچەکاندا..
مانگێکی یەك شەوەی نوێیەو
لە گەڕەکە برسیەکاندا.. نانێکی بە دەم نامۆیەو
لە پرسگەی سەری کاسی وڵاتیشدا
هەتا ئیستا..
پرسیارێکی خوێناوییەو.. پرسیارێکی بێ وەڵامەو
ڕێبواری ناو تەمتوومانو هاتو چۆیە!.

-9-

لەو ڕۆژەدا
ئەوە بولبول نەبوو خوێندیو
هەمووومانی کرد بە باخچەی شیعرو گێلاس
نا.. نا.. ئەوە
برین بوو، بوو بە مەل خوێندیو
ئەوە خوێن بوو باڵی گرتو
ئەوە سەری هەڵفریوی «سەردەشت»ێ بوو
بوو بە ڕۆژنامەو مانشێتو
بوو بە قوببەی گوڵاڵەیی
سەر پوورەهەنگی دەنگوباس.
لەو ڕۆژەدا
ئەوە ناڵەی هەورە برووسکەو

هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

چەخماخەی ئاسمان نەبوو لێمان بداو
هەر هەموومان بکا بە ڕەژووی سیاساڵ
نا.. نا ئەوە
تەقینەوەی تۆڵەو.. گرمەگرمی ئەو غەدرە بوو
لە ڕێی موسڵ
نیشتمانێکی لەرزان و
مێژوویەکی کرد بە زوخاڵ.
لەو ڕۆژەدا
ئەوە شاعیر نەبوو بەهارە شیعرێ بنووسێ.
ئەوە نەقاش نەبوو وێنەی ئاسکێ بکێشێ.
ئەوە شمشاڵژەنێ نەبوو عەشقی خوێندکارێ بژەنێ

ئەوە پەیکەرتاشێ نەبوو پەیکەر لە شاخدا هەڵکەنێ
نا.. نا.. نا
ئەوە تەنها سەردەشت خۆی بوو
لە یەك كاتدا كە شاعیر بێو كە نەقاش بێو
پەیکەرتاش بێو خۆشەویستی قەڵەمێكو
ئازایەتی چەند رستەیەك
لەناو رۆحماندا هەڵکەنێ.

-10-

بڕۆن سەرکەن بەناو تەلانی فرمێسکدا
پەپوولەیەکی سپی گەورە ئەبینن.. ئەوە ئەوە!.
بچنە ژوورە قورینەکانی کەرکووك و هەولێرەوە
کە نانی چاوتەرتان بینی.. ئەوە ئەوە.
لە هەر شوێنێ لەسەر ڕوومەتی منداڵێ
دڵۆپی ڕوونی بێکەسیو کرووزانەوەی برسێتیو
لەسەر ئەرزیش

مەمکەمژەی بێ شیرتان دی
دڵنیا بن.. ئەوە.. ئەوە!
لە بازاردا لەسەر تەبەقی بەردەمی
خەم لێنیشتووی پیرەمێردێکی بێچاودا
کە خودای گەورەیش نایبینێو
تەنها چوار حەڵوای لە سەرە
حەڵوا سپیەکەیان ئەوە..
لە هێلانەی کۆترێکدا..

لە دوو هێلکە کە بەرێوەن بۆ هەڵهاتن
کامیان پێشتر سەری ژیانی تیا جووقا
ئەوە.. ئەوە!
لە دوو قەڵەمی سەر مێزی
نووسەرێکی پاڵێوراو بۆ تیرۆرکردن
قەڵەمە ڕەنگ سپیەکەیان
ئەوە.. ئەوە!
لە دواییشدا

دەستکەن بە باخەڵی مندا
دوو قەسیدەی تازەی تیایە
دەریانبێنن
کامەیان بەفرێکی زۆری تیا باریبوو.
کامەیان گوڵی دارچوالەی زۆر گرتبوو.
کامەیان مانگێکی سپی تیا نووستبوو
بە ئەسپایی ماچی کەنو
دڵنیابن.. ئەوە، ئەوە!

-11-

لە سەفەرێكی شیعردا
لە قەراغ دڵی چەمچەماڵ
دوو گوڵ هێرۆی سەر لق سپی
بەرزم بینیو ناسینمەوەو
بە ڕاكردن چووم بۆ لایان
وتم تۆ سەردەشت عوسمان نیت؟
ئەویش سۆران؟!
ڕێگەم ئەدەن بۆ یادگاری ئەو دڵەی
داتان بە ڕۆژنامەی باران
ڕێگەم ئەدەن؟ پێكەوە وێنەیەك بگرین؟..

(با)یەك هاتو
پێکیشەوە سەریان لەقان!
«سۆران» وتی:
ئەی کێ وێنەکەمان بگرێ؟!
شیعرێکم پێش خۆم هاتە جواب:
خەمت نەبێ
لە دوو لاوە ئەمانگرن
«عەبدولخالق» لەسەر قەڵای هەولێرەوەو
لەسەر قەڵای مەقاماتی عەشقیشەوە
عەلی مەردان!

سلەیمانی بەهاری 2010

هەر جارێ کە خۆرنشین ئەبێ بە دەریاچەیەکی
ئەرخەوانیی کەناری ئاسمان و لێی وردئەبمەوە،
نازانم بۆچی کۆچی ئازیزێکم بیرئەکەوێتەوە؟!
لە پەڵە هەورە ڕەوەندەکاندا سیمایان و
زەردەخەنەیان و سەروقژیان ئەبینمەوە؟!
وەك ئەوەی بڵێن: ئێمە لێرەین و لەناو ئەم
ئاوابوونەدا سەرلەنوێ هەڵدێینەوە!
لە خۆرنشیندا جۆرە غەمگینییەك هەیە کە لەسەر
باڵە تەنکەکانی خۆی بە ئەسپایی هەڵمان ئەگرێ و
لە دواییشدا بە هێواشی لەناو مێرگە جوانەکانی
یادەوەریدا دامان ئەبەزێنێ!
لە کەژاوەی ئێوارەیەکی سپی و لە شێوەی خەوتێکی
پێڵو تەردا ئەو خەیاڵە باڵگرتووانە بردمیانەوە
بۆ شەوێکی بەفرانباری شاری "ئۆپسالا"ی
سویدو ماڵی سپی کاکە مەحمود!
هەردووکمان لە دەوری مێزێکی زیوینی شان و
مل بە کتێب و ئەلبووم و لە ژوورێکی چاو تەڕدا دانیشتبووین
لە دەریشەوەو لە پشت جامخانە بێگەردەکەوە
سێ ڕیز سێ ڕیز بەفر ئەباری ئەو بەفرە بە بێدەنگیی

هەست و نەست

هەردووکمانی بردەوە بۆ لای بەفری سلەیمانی‌و
بۆ گەڕەکی سەرکارێزو بۆ لای گۆیژەو گڵەزەردەو
سەرماو سۆڵەی زستانەکانی تەمەنی ڕابوردوو.
بە کاک "مەحمود"م وت:
تۆ ئەزانی ئەم بەفرەی ئێرە لە وردە شەکر ئەچێ‌و
بەڵام بەفری لای خۆمان کلوو کلوو وەک
ڕیزە پەپوولە دێنە خوارێ. کاک مەحمودیش وتی:
ڕاستە بە هیچ جۆرێ لە بەفری کوردستان ناچێ!
ئەم بەفرە بێ ڕۆحەو بەڵام بەفری لای خۆمان
پڕ بوو لە درەوشانەوەی ڕۆح‌و خەمە سپیە جوانەکان!
دوای هەناسە هەڵکێشانێ وتیەوە:
بڕوا بکە ئەوەتەی لێرەم خەوێکم بەم سویدەوە
نەبینیوەو لە خەویشدا هەر لەولام‌و لەلای سەرکارێزو
لەسەر گردەکەی یارە، دەمێك ئەبم بە گوڵ ئەرخەوان‌و
لە سەیوانم‌و دەمێکی تر مانگەشەوی سەر ئەزمڕم‌و
یان شەماڵێکی کانی با!
ئیتر هەر جارێك یەکترمان بدیبایە
بە ڕێگەکانی هەوادا

ئەچووینەوە سلەیمانیەکەی جاران و
کۆڵان بە کۆڵان و گەڕەك بە گەڕەکمان
بەسەر ئەکردەوە
لەوێ لەلای کەم کەس ئەم سووتان و
هەڵقرچانی ڕۆحە هەبوون و کەم کەسیش
ئەم کازیوەی عەشقەیان لە دڵدا بوو.
بۆیە جارێکیان کاك مەحمود وتی:
ئەگەر هەندێ لەم کوروکاڵە کوردانەی سوید
گوێیان لێمان بێ لەوانەیە بڵێن: ئەمانە
وڕێنە ئەکەن و سەری لێداون و شێت بوون،
ئەگینا ئەشکەوتی (جاسەنە)ی چی و بەردە قارەمانی
چی و چاپخانەکەی پیرەمێردی چی و یەحیا فەندی
ڕەسام کێیەو ئەحەی جاو کامەیەو کامەیە
مەحمود جەودەت و سەیرانی دوو لوولە چییەو
پیری شەوکێڵ لە کوێوەیە؟!
لە دەرەوە ورد ورد بەفر ئەباری و
ئەویش ورد ورد بەشێك لە مێژووی کۆماری
کوردستانی بۆ ئەخوێندمەوە.
دڵی کاك مەحمود لە دڵی منداڵ و لە پەڕەی

هەلالەو گولالەو لە خەرمانەی مانگەشەو ئەچوو
ناسك ناسك تەنها وشەیەك بەس بوو
بۆ ئەوەی ئەو پەڕە ناسکانە گەرد بگرن و
لێت بتۆرێ بەلام بە بێدەنگیی نە گلەیی
ئەکردو نە ئەیدایە ڕووت. کاتێکیش
ئەو هەورە ئەڕەوێوە ئەوسا ئەیوت:
ئێ ئومورت! حاڵ و ئەحواڵ ؟!
هەموو جارێکیش ئەو نامانەمان نیشانی
یەکتری ئەدا کە لەوێوە بۆ ولاتمان ئەنووسی
ئاخ و داخی دڵی پڕبووی خۆمان تیا ئەڕشت و جلی پیسی
شەڕی ناوخۆمان تیا هەڵئەخست و لە دڵسۆزییەوە
درەوش ئاسا چەرمی قایمی ڕووی بێشەرمی
هەندێکمان لە سەد لاوە کوناودەر ئەکردا
لەو هەڵوێستانەدا
کاك مەحمود لە کەلێکی بچووك ئەچوو
کە بەسەر ڕەوەزێکەوە وەستابێ و
بەردەوام بارژنی بێ!
پیاوێك لە بەفرو ئاگر
بەفر بۆ ئاکاری و ئاگریش بۆ ڕەخنەی.

پیاوێك لە سروەو لە زریان
سروە بۆ دەمو دووی لەسەرخۆیی‌و
زریانیش بۆ بێدەنگ نەبوون لە ناهەقیی.
دوای دارماتێکی گەورەی مێژوومان
لە هاوینی مل بەکوێنی 1975دا
ئەو کاتەی دوورخرابووینەوە بۆ ئەنبارو
لە کوردستاندا کلۆری دارێکیش نەمابوو
بۆ ئەوەی خۆتی تیا بشاریتەوە.
من لەولای قەزای هیتەوە لە گوندی بەغدادی‌و
کاك مەحمودو کۆمەڵێ لە عاشقانی ئازادیخوازی تریش
لەناو شاری ڕووماديدا. لەو مێژووە تاریکەداو
لە مەخفەرێکدا. قەسیدەی "کۆچ"م نووسی.
لە یەکەمین دەرفەتدا چووم بۆ ڕوومادی‌و لە شەوێکی
غەمگیندا سەرمان نا بە سەری یەکەوەو "کۆچ"م
بۆ خوێندنەوە. گەرووم داگیرسابوو. دەنگم
دەنگێکی بریندارو خوێنی لێ ئەچۆڕایەوە. لە دواییدا
کاك مەحمود وتی: شێرکۆ گیان! ئەگەر هیچی تریش
نەنووسیت ئەمەت بەسە! لە کتێبە جوانەکەی
کاروانی بێ کۆتاییشدا. ئەم یادەوەرییە



بووە بە چەند ڕستەیەکی جوان و لە شێوەی
ملوانکەیەکی مرواریدا کردوێتیە ملی کتێبەکەی!
بەڵێ کاروانی بێکۆتاییە
چونکە ژیان بێ کۆتاییە، خۆشەویستیی
بێکۆتاییەو لەم کاروانەدا کاك مەحمودی مەلا عیزەت
زەنگێك بوو لە گەردنی
ئازادیدا. لەو کاروانەدا قەڵەمێك بوو ئەیحیلان.
لەو کاروانەدا وەك هەتاو بێ منەت بوو.
چونکە (سەر) (سەر)ی خۆی و
حیلە حیلەی گەرووی خۆی بوو.
پیاوێك بە کوڵی دارهەنارو
بە وردە ئەستێرە موتوربە کراو
ئاخر بۆیە لە شەوی زینداندا ئەدرەوشایەوەو
بە ڕۆژیش گوڵجاڕی مێژوویەك بوو
سوور سوور ئەچۆوە.
خۆشەویستییەك لە باخچەو
باخچە لە لاسکی قەڵەم و قەڵەم لە تیشك و
تیشکێ لەو پیاوەی لە گزنگ دایەو
بیرناچێتەوە!

هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

## پیاوێکی تێکەڵ*
## لە شیعرو بادە!

# هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

شەمندەفەری شیعرەو ڕێی بێکۆتایی ئەبڕێ و
هەر واگۆنێکی بۆ نەوەیەکی شیعرو
تیتییەکی گردەڵەی ڕۆح سوکیش
ئەوە چل ساڵ زیاترە بێ ئۆقرەیەو
لارە لارە، ئەمسەرو ئەوسەری
ڕیزە واگۆنەکان ئەکات و
بە دەم قوملێدانی بادەو وشەوە
لە کۆن و نوێ عەشقی تیا ئەڕسکێ!
مەستی مەجازەو
مەستی زمانی شەرابیی و
خوماری خەم و مەراقی سپی و
دەستیش بەسەر سەری
هەموو نەوەکاندا ئەهێنێ!
ئەوە "زامدار"ەو زێڕیڤانی دارستانی شیعرو
هاوڕێی بەوەفای پەیمانەی بێکەس و هێمن و
هاوڵاتیەکی چوارینەکانی خەیام!
ئەوە.. زامدارە ژێیەکی گەرووی
قۆرياتی کەرکوك و.. سەمای شووشە مەیێکی

مەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

لە "زۆربا" چووی سەر دیواری بەرزی قەڵات!
درەختێکی چاکەت و پانتۆڵ لەبەری شڵەژاو
زەردەخەنەی سەرخۆش بەسەر شەقامی شاراندا
ئەبەخشێتەوە و سنگی هێلانەیە بۆ گمەگمی قەسیدەو
سەریشی پڕە لە باران.
ڕووبارێك لە زمانی کوردیی ڕەوان.
شەپۆلانێك لە حەیران.
هاژەهاژی لە لاوك و
قاسپەقاسپێ لە کەوێکی بەرهەیوان.
نەورەسێك تەمەنی داوەتە دەست
مانگەشەوێکی سەرخۆش و
جەستەی کردۆتە خەرمانەو
نە لە دوێنێدا ئەفڕێت و
نە ڕۆژژمێری ئایندە ئەژمێریت و
ئەوەی بۆی ئەخوێنیو بۆی ئەژیو
شەقژنی لەناودا ئەکا ئێستەیەو ئێستا!
پیاوێك نیوەی تەواوی لە منداڵ و

هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

لە کرۆکاڵی ساواو نیوەکەی تریشی
لە گەواڵە هەوری جاویدان.
تەمەنێك نیوەی پڕ لە ماسیەکانی دیجلەو
پڕ لە شەوی بێداری ئەبونەواس و
نیوەکەی تریشی لە کورسی تەختەو
لە پیاڵەی چایخانەکانی
سەر شەقامی ڕەشیدو
لە غەڵبەغەڵبی ڕۆژنامەفرۆش و
لە پەڕەپەڕەی کتێبەکانی "سوق السرای" و
پیاوێك لە بەفرو
بەفر لە شیعرو
شیعریش لە گوڵجاڕەکەی نوێخوازان!
ئەوە.. زامدارە
عەشقێك بێ ئارایشت و ڕتووش و
عاشقێك کە هەر لە خۆی ئەچێ و لە کەسی تر نا!
قەڵا وا ئەڵێ قەڵا!
بە درێژایی ئەم مێژووی خوێنە

مێروولەیەك بەوی نەوت: ئاخ لە تۆ!
بە پانایی.. ئەم هەموو غەدرە
پەپوولەیەك بەوی نەوت داخ لە تۆ.
بە قوڵایی ئەم هەموو تاوانە
گەڵایەك، چرۆیەك، بنچکێ. باخچەیەك
بەویان نەوت: چش لە تۆ!
ئەشێ دەستی ڕاستی خۆی زیانی
بە دەستی چەپی خۆی گەیاندبێ. ئەشێ قاچی ڕاستی
خۆی سەری لە قاچی چەپی خۆی شێواندبێ.
ئەم گوێچکەی لەو گوێچکەی. ئەم چاوی
لەو چاوی وەلێ هەرگیز ئەوەی لای ئەو
ڕووینەداوە: شێواندنی دەموچاوی
ئەم وڵاتەو ئینسان بووە!
ئەی پیری تەریقەتی بادە!
ئەی مجێوری ماڵی وشەو ماڵی ڕستە!
نۆش!
نۆشی ئەو شیعرانەی پەی دەرپەی

لە مەیی خۆشەویستیان بۆ تێنەکردی
خۆشەویستیی دوو وشەی باڵدار
دوو وشەی تازە!
نۆش!
نۆشی جوانیی ئەو پەلکەگیایانەی
لە هەڵبەستی گەنجێکی ئەمڕۆدا ئەڕسکێن.
نۆشی شیعری مێینەی سەروقژ ئازاد.
ئەی پیری مەیخانەی ئەفراندن!
هەڵیبڕەو نۆش!
نۆش بە یادی (باخۆس)ی خواوەند
کۆنترین خواوەندی سەرخۆش.
کۆنترین پەیمانەو
نۆش بە یادی تازەترین بادە!
هەڵیبڕەو نۆش!
بە یادی کەرە مەستەکەی نالیی!
بە یادی دارەوەنە خومارەکەی نالیی .
بە یادی حوجرە سەرخۆشەکەی نالیی .

مەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

نۆش بە یادی جوانە بێ ناوەکەی گۆران
وەختێ قژی زەردئەبێ بە شیعری
زەردو سەرتاپامان دائەپۆشێ.
نۆش بە یادی ست فاتیمەی هەردی
وەختێ لارولەنجەی لەشی ئەفسوناویی
ئەبێ بە پرژەی مۆسیقاو بە گۆرانیی و
تنۆك تنۆك لە قەڵەممان هەڵئەپرژێ.
نۆش بە یادی وا بادەوەی
ساقی هێمن. وەختێ غەریبیی
لە کونجی مەیخانەیەکی بەغدادا
ئەبوو بە کۆترە باریکەی حەسرەتێك و
ئەهاتە سەر مێزی مەست و
ئەوا ئیستەیش بەو یادەوە
هەمان کۆتر هاتۆتەوەو
لەسەر لێواری پەرداخی دوا قەسیدەم
خەماوی و کز هەڵئەنیشێ!
نۆشی.. پەپوولەیەك وشەی تازە.

ئەو کاتانەی قۆزاخەکەی بۆ یەکەمجار
بەجێدێڵێ
ئەچێتە ناو ماڵانەوە.
نۆش بەر لەوەی مردن بێت.
نۆش و نۆش!
بە یادی "ڕوانگە"ی ئەوسا
وەختێ کە نوێخوازی هەرە تازە
بە کراسی ئاودامانی بارانەوە هات و
بە دوو دەستی پڕ لە پرشنگەوە هات و
دووباڵی هەتا ئەو کاتە نەبینراوی
دا بە شیعری هەموومان و
تۆ خۆیشت بووی بە دەروێشی و
زۆر کەڕەتیش
پەنجەکانت وەکو سەرت
حاڵیان لێئەهات!
پیاوێك لە گوڵەلاولاوی زمانی کوردی.
پڕپڕ لە چڵە نێرگزو پڕپڕ لە گوڵی دارهەنارو

هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

لێوانلێویش لە بۆنەکەی گوڵە کێوی.
پیاوێك.. لە بێ دەربەستیدا.. بووە بە دەربەست
لە گریاندا ئەپشکوێ‌و ئەبێ بە پێکەنین.
لە بێهودەییدا.. پەنگی خواردۆتەوەو بووە بە ئومێد
لە نەبوونیدا بووە بە بووە.
پیاوێك نە گوێ ئەداتە ڕۆژژمێرو
نە سەعات‌و نە هەتاو و نە سێبەرو
نە سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆرداو
نە سیاسەت‌و نە گەمەکانی دەوڵەت‌و
کەچی خۆیشی بۆ هەموومان بووە بە مێژوو!
ئەوە زامدارەو زامەکانیشی هەر بە دەستی
شووشەی بادە. ئەوە زامدارە. سێوە،
سێوە لاسوورەیە لە وەختی (با) خوێندنەوەدا. هەنارە،
هەناری پەخشان، لە وەختی سەماکردندا. ترێیە، ترێ
ڕەشکەیە، لەناو ڕەزی بیرکردنەوەو یادگاردا. سەرتڵی
هەنجیرە زەردەی چیرۆکە
ئەوانە هەموویان لەناو یەکدا ورد ئەکەم.

لەگەڵ یەکدا ئەیانشێلم. ئەیانکەمە ناو قازانی
دیوانمەوە. ئەیانخەمە سەر ئاگرەکەی قەسیدەی ئاڵ
هەتا ئیتر هێدی هێدی، تنۆك تنۆك،
لەو سەرەوە دڵۆپ دڵۆپ دێنە خوارێو هەتاکو ئەبن
بە زامدار، ئەبن بە عارەقی ڕەش و سپی، بە ئۆزۆی
حەوت، ئۆزۆی دوانزە، بە چوڕەی زێڕینی
ویسکی. ئەوسا پەرداخێ تێئەکەم ئەیدەمە
دەست دوا قەسیدەم.. هەزار جاریش ماچی ئەکەم.
ڕێزێ لە شمشاڵی سەرخۆش
وەختێ شمشاڵ ئەبێ بە پەیڤی هۆشداریی.
ڕیزێ لە مێرگێکی زامدار
ئەو وەختەی مێرگ ئەبێ بە ئاوێنەی جوانیی.
ڕیزێ لە گوڵەبەڕۆژە
ئەو وەختەی گوڵەبەڕۆژە
ئەبێ بە چاوی قەسیدەی هەر هەموومان.
ئەوە زامدارە! ئەوە تیتیەکەی قیتاری
هۆنراوەیەو چل ساڵ زیاترە دێو دەچێو
لارەلارە، واگۆن واگۆن، هەموو ڕۆژێ

هەست و نەست

شیعرە جوانەکان ئەژمێرێو قومێ شیعرو قومێ
بادەو، لارە لارە، خودایە با هەر بمێنێ
ئەم قیتارەو ئەو زامدارە!

سلەیمانی
2009/2/24

* ئەم پەخشانەم بۆ کۆڕی ڕێزلێنانی هاوڕێی عومرم کاکە مەحمود زامدار نووسیوە.

بۆ گیانی سپی جوان‌و زیندووی هاوڕێم
کاکە ئەکرەم قەرەداغی!

## 1ـ بە دەم هەناسەی شیعرەوە!

هەر وەکو چۆن خۆشەویستیی ئاو بۆ زەوی‌و
زەوی بۆ گوڵەگەنم‌و گوڵەگەنم بۆ ژیان‌و
بەردەوام بوون، تەواو نابێ‌و ئاوا نابیت..
هەروەکو چۆن عەشقی درەخت بۆ باڵندەو
باڵندە بۆ ئەم ئاسمانە تەواو نابێ ئاوا نابی
هەر بەو جۆرەیش خۆشەویستیی چاوی ئێمە بۆ پەنجەت‌و
بۆ قەڵەمت‌و یادگارت تەواو نابێ‌و ئاوا نابێت.
تۆ هەڵهاتنی هەمیشەی جوانیەکانی لەناو
سەری هەمووماندا. تۆ مانگە شەوی زانستی
سەردەمیت‌و سووڕانەوەی هەسارەکەی
خۆشەویستیت بە دەوری سەری وشەدا.
ئاوا نابیت!
ئێمە ماڵئاوایی ناکەین لە قەڵەمێ
کە ڕۆژانە لە نێوانی پەنجەکانی
ئەم شارەدا بێت‌و بچێ.
ئاوا نابیت وەکو ئارمی سەر کتێب‌و
گۆڤارەکانی دیدەمان لەبەرچاوی

تۆ ئاوێنەو تۆ گوڵدانی
یەك بە یەکی ژوورەکانیو
تۆ پەنجەرەی هەتاویتو
بەسەر سبەیدا ئەڕوانی.
تۆ ئێستاکە بوویتە گڵۆپی سەر مێزو
بوویتە مەرەکەبی چاپو وای لە شاشەی
کۆمپیوتەری بەردەممانداو
دوورو نزیك
وەك تەلاری سەردەم دیاری.
ئاوا نابێت!
ئێمە ماڵئاوایی ناکەین
بۆچی تیشکەکانی زانست ئاوا ئەبن
تا ئاوا بێت؟
ئێمە ماڵئاوایی ناکەین
لەو درەختە بەخشندەیەی
هەر گوڵێکی وشەیەکەو
هەر چڵێکی وتارێکەو
هەر لقێکی فەرهەنگێکەو
ناو قەدی سەفتەی کتێبو

گەڵای زانست چاوەکانی!
ئەی هاوڕێ!
تۆ ئیستاکە ئەستێرەیەکی گەڕیدەی
دەم بە ورشەی ڕەنگ زیوینی
شەوی شاریو ئاوا نابیت .
وەك چوار وەرزی گۆڤارەکەت
لەناوماندای
لە ژمارەی بەهاردا تۆ
نێرگزەکەی سەر بەرۆكو
فرمێسکێکی هەشتی مارتی ناوچاومانی .
لە ژمارەی هاویناندا بۆنو بەرامەی ڕێحانەو
گوڵە عەترو شنەشنی (با)ی کوێستانی.
لە ژمارەی پاییزاندا
زەردەخەنەی گەڵایەکی هەڵلەرزیوی نێو ڕۆحمانی .
لە ژمارەی بەفرانبارو زستانیشدا
تۆ یان کلووی بەفری نوای
ئەودیو شووشەی پەنجەرەیتو
یاخود نمەی بارانی سەر چەتری دەستو
کزەکزی هەناومانی..

ئاوا نابیت
وەك كتێبخانەو قەڵەمو
ستوونەكانی فەرهەنگو ڕەنگی بەرگو
خۆشەویستیی سلەیمانی. ئاوا نابێ
وەك قەرەداخ ئاوا نابێ
ئاوا نابی!

## 2ـ ئەو کاتەی لە پڕێکدا تاڤگەیەک دڵی ئەوەستێ!

ئەو کاتەی لە ناکاوێو لەخۆوە
ئەستێرەیەک ئەکشێو سەر بەرەو خوار ئەبێتەوەو
ون ئەبێ. ئەوسا ئیتر هەسارەیەک تووشی
سەرسامیو شۆک ئەبێتو ئاسمانیش لە شینایی
خۆیدا پرسەی شینی بۆ دائەنێ. ئەو کاتەی تاڤگەیەک
لەخۆوە دڵی ئەوەستێو هاژەهاژی لاڵ ئەبێو
زەردەخەنەی وشک ئەبێ ئەوسا ئیتر گۆمەکانو زەریای
بەرینیش لای خۆیانەوە بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگ
ئەبنو تەمو مژ ئەدەن بە خۆیانداو خۆرنشینیش
قەسیدەیەکی غەمگین ئەنووسێ. ئەو دەمەی
کتێبخانەیەک لە پڕێکدا خەیاڵێکی ئەمرێ ئیتر ڕەفەی
بەرزو نزم وشە هۆن هۆن ئەرێژنو بەسەر
قەڵەمدا ئەگرینو کورسی چۆڵیش وەکو قژی
ژنە کتێبێ ئەپەشۆکێ. ئەو دەمەی قوتابخانەیەک لە

پڕێکدا ڕستەیەکی ئەمرێ، یان شیعرێکی دڵی ئەوەستێ،
یان سروودێکی بەلادا دێ. ئیتر زمان خۆی،
ڕێزمان خۆی، پیتەکان هەر هەموویان بەڕیز
کۆتەڵیان بۆ ئەگێڕن و مەرەکەبی ڕەشیش دایان
ئەپۆشێ. ئەو وەختەی هێلانەی گۆرانیەکیش
لە پڕێکدا هەواڵی مەرگی باڵندەیەکی خۆشخوانی ئەبیسێ
ئیتر هێلانە بە پوش و پەڵاش و پژوپۆوە، هەر هەموو
وەك ئاسمانیان بەسەردا بڕوخێ، فڕینیان گرمۆڵە
ئەبێ و تەپ و تۆز دایان ئەپۆشێ.
ئەم قەڵەمەی ئێمەیش هەر بەو جۆرە
لە پڕێکدا لە بەردەم وشەداو
لە بەردەم وێنەی شاشەداو
لە بەرچاوی گۆڤارەکەیدا دڵی وەستاو
ئەوسا ئیتر قەڵەم قەڵەمی ئەژنۆی شکاو
نە پەنجەرەو نە کورسیەکەی و نە پەڕە کاغەزو
نە کتێبی کراوەی بەردەمی.. نەیانزانی ئەم
کۆستە چۆن ڕوویدا؟
ئەو بۆ وشە ژیا
بۆ وشەیش مردو بۆ زانست بوو بە

هەسارەو هەر لەوێشدا لەسەر چوکڵەی ئەستێرەیەك
گیانیدا..
ئەو شەوو ڕۆژ ئەگەڕا بە شوێن پەنجەرەیەکی
عەقڵدا. بە شوێن هەواڵی زاراوەیەکدا، بە شوێن پێکهاتەیەکی
تازەی سروشتدا ئەگەڕا بە شوێن نەهێنیەکانی فیزیکدا،
بە شوێن تێکەڵەیەکی نەدۆزراوەی کیمیادا. بە شوێن چرایەکی
پەروەردەدا. ئەو ئەگەڕا بە شوێن جوانیی ژیاندا!
وەلێ ئەمە ژیانە
خەوێکی کورتەو شانۆنامەیەکی بێهودەو
تەمەنێکی دەم (با)..
تەمەن بە ساڵ ناپێورێ
درەخت هەیە تەمەنی سەد ساڵەو بەلاّم
دەمی کەسێکی شیرین نەکردووەو مێژووی چۆڵ و هۆڵە
بۆ پاشەڕۆژ زڕو ئاو هەیە تاڵ و چرا هەیە
چەواشەکەرو نە ئەویان قوومێکی لە ئەوین داوە
بە کەس و نە ئەمیشیان بۆ کەس بووە بە سایەو پەنا.
ئەکرەم قەرەداخی
لەناوماندایە، وەك، ڕاستیەکانی زانستو
وەك ڕۆمانی کەڵەگەت و وەکو ئەلف و بێی


هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

زمان و وەکو هەشتی مارت و چون تێلەتێلی
ئاگری هەموو ساڵێکی سەر چیا.
ئەکرەم قەرەداخی
بە تەنیا بۆ ئەکرەم قەرەداخی نەژیا
ئەو ئەبوو: بە پەلکەگیا بۆ مێرگی زمان و
ئەو ئەبوو: بە سەمەل و شارا بۆ مرۆڤ و
ئەو ئەبوو: بە تەباشیر بۆ قوتابخانەو
ئەو ئەبوو: بە شەبەنگی ڕەنگ بۆ چاپخانەو
ئەو لەبەرچاوەکانی زانست ژیا.
ئەوەتا ئەو، هەر دوو جگەرگۆشەی خۆی نییە
ئەوەتا ئەو بە دەیان چراوگی لێبووە.
بە دەیان کچ و کوڕی قەڵەمی لێکەوتۆتەوە.
بە دەیان کانیی کرد بە ڕووبار
بە دەیان بنچکی پەروەردە کرد تا بوون بە دارستان!
ئەکرەم قەرەداخی
لە چاوی ئەواندایە وەکو سۆما.. ئەوا ئێستەیش
لە کچەکاندا.. پرچی درێژی بارانێکی ڕەشەو
لە کوڕەکاندا.. مووی ڕیش و سمێڵێکی غەمگینەو
لە ڕوحیاندا.. ورەی بەردەمی تاقیکردنەوەیەو

لە لەشیاندا.. گوێچکیلەیەکی دڵەو
لە سەریاندا.. وزەی داهێنان!
ئەکرەم قەرەداخی
ناوێك هەمیشە فەرهەنگ لە بیرێتی
پاکێك لە بەفرو بەفر لە ڕەوشتو
ڕەوشتیش لە گوڵی دار چواڵە.
ئەکرەم قەرەداخی
زەردەخەنەیەك.. لە گوڵە زەردو.
چالاکییەك لە شانەی هەنگداو
تێرامانێ.. لە بینی ئاوو
ماندوونەبوونێ.. لە جەستەی ئەسپو
کەیفو زەوقێ.. لە دڵی چواردەساڵدا.
من ئیتر لێرەدا ئەوەستمو
دوای من قەڵەمەکەی دێتە سەر شانۆو
چیرۆکی خۆیو شەونخونیتان بۆ ئەگێڕێتەوە.
من ئیتر کۆتایی بەم قسانەی خۆم دێنمو
لە دوای من گۆڤارەکەی دێتە سەرشانۆو
لاپەڕە بە لاپەڕە، قسەی خۆیو ئەکرەمتان
بۆ ئەکا!
من ئیتر لێرەدا بێدەنگ ئەبمو

هەست و نەست

چاویلکەکەی دێتو باسی چاوی خۆیو
چاوی ئەکرەمتان بۆ ئەکا!
من ئیتر ئەڕۆمو دوابەدوای من
زانست خۆی دێو باسی هزرو زرنگیو
ڕەنجەکانی ئەوتان بۆ ئەکا.
من ئیتر ئەم شانۆیە جێدێڵمو
پەروەردە لە شێوەی مامۆستایەکی کەڵەگەتدا
دێتە بەردەم ئەم مایکرۆفۆنەو
جێ پەنجەی ئەکرەمتان لەسەر دڵی نیشان ئەدا!
دوای ئەویش
نیشتمان لە شێوەی گەواڵە هەورێکدا
دێتە سەر شانۆو چەخماخەی خۆشەویستیی
ئەکرەم لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێو
هەور ئەیکا بە ناڵەناڵو
هەور ئەیکا بە ڕێژنەو
سەرتاپای پەردەو سەرتاپای کورسیو
سەرتاپای هۆڵو
سەرتاپای ئێوەیش هەمووتان
لەناو خۆیدا نوقم ئەکا!

سلێمانی
2009/4/14

ئەوەتەی هەم، ئەمە پێناسەی هەمیشەیی من بووە:
مێژوویەکی مل بە کوێن و سەر بە کۆتەڵ و جوگرافیایەکی
ئەنجن ئەنجن کراوو تەندوورەو گێژەنی خوێنی بەردەوام و
قەڵەمی منیش بە چواردەوری هەموویاندا
ئەسپێکی ناوچەوان سووری بێ ئارامی چوارپەل شپرزەی
بە کورژن و بە سمکۆڵی سەر بە هەنیسک هەڵگیراو.
ئەوەتەی هەم: ئەمە چیرۆکی بێ کۆتایی من
بووە: دووکەڵ بە دوای دووکەڵدا. دەربەندێ
لە ئاگرو شاخێ لە هەڵقرچان و پێدەشتێ لە تەمتومان و
دەریاچەیەك لە مەراق و ڕێگایەك لە ئازاری
بێ ناونیشان!
لە ڕۆژهەڵاتی ئەم ئازارە سەرسەختەدا بوو
پەیامێك لە شەختەدا بوو بە گوڵە مێلاقەی دووی
ڕێبەندان. پیاوێکی باریکەڵەی ڕیش تەنکی،
لە تیشك چووی موتوربەکراو لە خاك و خۆڵی
موکریان، پیاوێك تەمەنی یەك ساڵەی ناو
بەفران باری، تەمەنی یەك ساڵەی ڕێچکەشکێنی
لە زەماوەندی خوێن و ئازادیدا، زەمانی بەجێهێشت و

ئەو ساڵەی بوو بە سەدان ساڵ!
لەمەوە میراتێ لە پەتی سێدارەو لە ملی کەڵو
لە ڕەنگی شەفەقو لە سروودی بەفرو کێوو
لە فڕینی باڵندەی خوێنو لە شەپۆلانی چنگ
بە خۆڕ، بۆ ژنو پیاوی ئەم ڕۆژهەڵاتە
بەجێماو ئیتر سێدارە بوو بە پلیکانەو
ملی کەڵ بوو بە زەنگو شەفەق بوو بە
ڕووگەی سوێندی گولاڵەییو سروودی بەفر
بوو بە سروودی ژیانو شەپۆلان بوون بە
ڕەوە ئەسپی جەستەمانو بە هێمای نەگەڕانەوەو
کۆڵ نەدان.
یەك لە دوای یەك
گوڵ لە دوای گوڵ
درەخت لە دوای درەخت
مامز لە دوای مامز
پڵنگ لە دوای پڵنگ، هاتو چوو
تا گەیشتینە ئەو هەیوانی مانگەشەوەی
دەم بە خەندەی دڵە جوانەکەی "قاسملوو"

هەیوانێ لە کتێب
مانگەشەوێ لە کاغەز
خەندەیەك لە وشەو
قەڵەمێ لە تیشك.
هێدی هێدی بە هێمنی کزەبا هات
کۆپکە کۆپکە، چرۆچرۆ، کەڵاکەڵا پەلی هاویشت
لە چراخانی ناو هزری ئەوروپادا کەوتە باڵا
دڵۆپ دڵۆپ بوو بە ئەستێرکی چاوانی ئەم نەخشەیەو
سەمەل سەمەل بوو بە دەغڵی بە کەروێشکەی
بەردەم ئاوێنەی هەتاوو
شەپۆل شەپۆل بوو بە دەریا!
زەردەخەنەیەك لە شنە
پەپوولەیەك لە گەڵا
ئەستێرکێ لە چراو
دەغڵێ لە زیرەکیو
ئاوێنەیەك لە بروا.
بە نووکی قەڵەم کەوتە هەڵکۆڵینی مێژوویەکی ناو بەردەڵان
هەڵکۆڵین لە تاریکیدا.. هەڵکۆڵین بە چاو.

هەست و نەست

هەڵکۆڵین لە ئازاردا.. هەڵکۆڵین بە وشە.
هەڵکۆڵین و هەڵکۆڵین.. تا گەیشتە ڕەگەکانی
دڵی مێژوو.. ڕۆحی مێژوو.. جەستەی مێژوو.
تا گەیشتە بنی سۆنگە
تا گەیشتە بنی ڕووداوو کارەسات
بنی ژان و بنی خەمی هەرە قوڵی ئەم گەلە.
سووربوونێ لە پەنگر
توانایەك لە زریان
بەردەوامبوونێ لە ئاوو خۆرەتاوو
سامالێك لە عەقڵ و
زرنگییەك لە گزنگی دەم بە یان!
قاسملوو.. پەیژە بە پەیژەوە.. ئەستێرە لەسەر ئەستێرە.
تاڤگە بە تاڤگەوە.. کتێب لەسەر کتێب.
قەڵەم بە قەڵەمەوە.. ڕستە لەسەر ڕستە.
ئاواز بە ئاوازەوە.. چریکە لەسەر چریکە.
بۆ هەڵگەڕان و سەرکەوتن
بە دیواری شەوەزەنگدا.
پەیژەیەك لە پەیام.

ئەستێرەیەك لە ڕێبەر.
تاڤگەیەك لە بەژن و.
قەڵەمێك لە خۆرستان.. قاسملوو!
ئەو.. لە ناو هەموو شتە جوانەکاندا ئەتبینییەوە:
لە ڕێزەی باراندا. باڵای.
لە بۆنی باخاندا.. قژی.
لە لاسکی گژوگیادا.. پەنجەی.
لە تام و چێژی ناوڕۆحدا.. قسەی.
تۆ ئەگەر ناوی گوڵەکانت بژماردایە
ئەو ناوی ڕەنگەکانی بۆ تەواو ئەکردی.
تۆ ئەگەر باسی ڕووبارت بکردایە
ئەو ئاوی سەرچاوەو هاژەهاژی
بۆ باس ئەکردی.
تۆ ئەگەر بتوتایە ئەم شەرابە چەند ئاڵە
ئەو ڕۆژی لەدایکبوونی پێ ئەوتی.
تۆ ئەگەر بتوتایە ئەم هاوارە چەند قوڵە
ئەو ناوی یەك بە یەکی زامەکانی پێ ئەوتی.
لەناو پێکەنیندا.. نوکتەیەکی ئێسك سووك بوو.

لە ناو گریاندا مۆمێکی سەبووریی
لە کۆڕی یاراندا گوڵدانێکی ڕووح سووکی خۆشەویستیی .
لە تەنگانەدا مەشخەڵێ لە ئیرادەو
لە سادەییدا.. گوڵە کێویلەیەکی دەوری شوکاك.
ئەو عاشقی موزیك بوو
وەك عەشقی نێوان قاسپەو کەژ
ئەو عاشقی شیعر بوو
وەك عەشقی نێوان مانگەشەوو هەست
ئەو عاشقی ئازادیی بوو
وەك عەشقی نێوان قوربانیی و
سومبولی ئەرز!
لە ڕۆژهەڵاتی ڕقدا
هێشتا تیغەکان خوێنیان لێ ئەچۆڕایەوە
ئەو وتی: لێبوردن!
لە ململانێی تۆڵەو کینەدا
هێشتا بۆسەکان لە گەرمەی ڕاوکردندا بوون
ئەو وتی: گفتوگۆکردن.
لە دنیای قەڵاچۆکردنی نێوان پەیمانەکاندا

ئەو بەر لە هەمووان وتی:
پێکەوە هەڵکردن و
لەناو بیروباوەڕی داخراوی ئەوپەڕگیریدا..
لە سەردەمی دەرگا داخراوەکانی دنیادا
لە ڕۆژگاری چوونەوە ناو قاوغی گۆشەگیریدا
لە وەرزی چەق بەستن و یەك ڕەنگیدا
ئەو بەر لە هەمووان وتی:
کرانەوەو
هەمەڕەنگی و
ڕێگای گۆڕان!.
قاسملوو
هزرێك لە ئاوێنەی بەرهەتاو
ئەو ئاوێنەیەیش لە خۆشەویستیی خەڵکیی
ئەو خۆشەویستیەیش لە پەیفی ئازادیی و
ئازادیش لە جەستەی شەهیدان.
قاسملوو
پیاوێك لە پەنجەرەی گوڵ هەنار

پەنجەرەی گوڵ هەنار لە نواڵەی سنگی قازیو
سنگی قازی لە سنگی سابڵاخو
ئەو سنگەیش لە سنگی نیشتمان.
ڕۆژ لەگەڵ ئایندەدا هاتو
ڕۆژ لەگەڵ مەرگی عاشقاندا ڕۆیشتو
ڤیەن
ویستگەیەك بۆ خەباتی سپی..
ویستگەیەك بۆ گرێدانی لوولەی چەك.
پشوویەك لە نێوان قوربانیو تابووتەكاندا.
هەوڵێك بۆ گرتنەوەی لووزەوی خوێن.
بۆ كەمكردنەوەی ژمارەی بێوەژنەكان.
بۆ زۆركردنی ژمارەی منداڵەكان!..
بۆ بچووك كردنەوەی گۆڕستانەكان.
بۆ گەورەكردنی باخچەكان.
ڤیەن!
لەمبەرەوە
گمەگمو لەوبەرەوە چەند چەقۆیەك.
لەمبەرەوە ئەسپێكو دوو جوانووی ترو

لەوبەروە چەند شمشێرێك.
لەمبەرەوە
سێ باڵی گۆرانیو لەوبەرەوە چەند مقەستێك
لەمبەرەوە
سێ درەختو لەو بەریشەوە سێ تەور
ڤیەن
عەبدوڵلا قادری ئازەر
بەفرێکی لووتکەی، مانگ بەسەر.
ڕووبارێ لە هەڕەتی هاژەهاژەدا.
سروودێکی سوور لە کفەکفی دەوروزەماندا.
عەبدوڵلا قادری ئازەر
گەنجێك لە شێوەی گوڵە عەتری تێکەڵ بە مۆردو
"پاریسی بۆن خۆشتر کردبوو"،
یاقووتێ بە گەردنی شەوێکی سپیەوە
"کەناری "سین"ی جریوەدارتر کردبوو"
دوکتۆر فازل..
جوانوویەکی شینی چوارپەل بەفرینی

باڵ نارنجیی..
حیلەی لە حیلەی ڕەشەبای سلەیمانیو
سەروکەڵلەی لە ڕەوەزی پیرەمەگروونو
ڕێگای غاری ئەرخەوانیی..
ڤیەن
لە ڕۆژێکی شوومدا
لە ژوورێکی شوومدا
لە مێژوویەکی شوومدا
ڤیەن
ئەمان دەمو چاوو دڵیان وەکو یەك
دەمو چاو کۆترو، دڵیش هەر کۆتر.
ئەوان دەمو چاو بە دەمامکی زەردەخەنەو
بەڵام دڵیان پڕ ژەهر
هەردوولا بە گوڵەوە هاتوون
ئەمان لەگەڵ گوڵدا پەپوولەیشیان هێناوە
پەپوولە
ئەوانیش لەگەڵ گوڵدا
چەقۆیان ڕواندبوو چەقۆ!

ئەمان هەرسێکیان لە کەژاوەیەکی سپیدان و
کەژاوەکەیش لە دڵی منداڵ. لە دڵی ئاو. لە دڵی باخچە ئەچێ.
ئەوانیش لەناو شەوی جبەکەیدان و جبەکەیش
لە دڵی دیناسۆرو لە دڵی خومپارەو لە دڵی مردن ئەچێ!
ئەمێستا
لە شەقامە بێ خەم و بێگەردەکانی ڤیەندا
لە جێی باران بەسەر مۆزێك و بەسەر شیعرو
بەسەر ماڵی ئۆپەراداو بەسەر پارکەکانداو
بەسەر تەلاری دادگاداو
بەسەر پۆلیسی نوستوودا
غەدر ئەبارێ!.
تاڵە مووی ڕیشی درێژی زوڵم ئەبارێ
شیری( ذوالفقار) ئەبارێ
لە ڤیەندا
غەدر چۆڕاوگەیە غەدر
لە پلوسکی نهۆمی بەرزو نزمەوە
بە دەم لاوکێکی تازەی ئەم کۆتەڵە ناوەختەوە
جۆگە جۆگە

مەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

دێتە خوارێ
ئەمێستاکە
ئەسپی سپی هەموو جەستەی شەڵاڵی غەدرێکی سوورەو
بە تەنها هەر سەروملی بە سپێتی ماونەتەوە..
هەردوو جوانووە لەش سەوزەکەیش
بوون بە دوو دار بەڵاڵووکی سوورو
پاڵکەوتوون و
تەنها چڵەپۆپەی ملیان بەسەوزێتی ماونەتەوە.
«حەیران.. حەیرانێ
ئەسرین رێزانێ.. بابان وێرانێ
غەدری تاڕانێ..
ئەمن دەمگوت برادەرینە
ئەوە نە جاری ئەوەرینەو نە هەزار
ئەنگۆ چلۆن دری خۆتان
لە بەردەمی عەجەمان دادەنێن و
ئەنگۆ چلۆن دەیدەنە دەس قورا پی تاران
ئەمن دەمگوت سەد حەیف و سەد خەسارێ
لۆ ئەو ئەسپە سپیانەی لە وراتێ غەرییانێ

کەوتنە نێو داوی تارانێ..
حەیران حەیرانێ.. ئامان ئامانێ
جەستە ڕێزانیو بابان وێرانێو
غەدری تارانێ».
لە ڤیەندا
وەختێ پۆلیسی نوستوو خەبەریان بۆوە
کلاوەکانیان دزرابوو.
وەختێ قانونی نوستوو خەبەری بۆوە
ترازۆکەی سەر دادگای دزرابوو.
وەختێ ترافیکی سەر شەقام خەبەریان بۆوە
ماتۆڕ سوارەکان.. گلۆپەکانیان بە ڕەنگەکانیانەوە
فراندبوو..
لە دوای کوشتنی ڕووناکیی
هەموو داوای لێبوردنێ ئەکەوێتە تاریکییەوە.
لە دوای سەربڕینی هەموو هەقێ
ئیتر لێخۆشبوون ئەکەوێتە ڕۆژگاری ناهەقییەوە.
ئەسپ کوژان.. قاچاخچیەکانی سەر مەرزو سنوور نەبوون.
نا.. نا

باخ کوژان.. تەورە نەخوێندەوارو ناهوشیارەکانی
باشووری تاران نەبوون.
دەغل کوژان.. لەشکری (سن و کوللە)ی
ڕاستەقینە نەبوون.
نا.. نا
مانگ کوژان.. چەقۆکەشە بێکارەکانی
دوای نیوەشەوی ژێر چوخم و کۆڵانی چۆڵ نەبوون.
ئەوانە کۆمەڵێ قەڵەمی زێرینی پیاوکوژ بوون.
کۆمەڵێ ڕۆژنامەی خوێن ڕێژ
کۆمەڵێ کتێبی وەحشی
کۆمەڵێ شووشە مەرەکەبی ژەهراوی
کۆمەڵێ فاکسی فاشی بوون.
ئەوانە کێردە خوێندەوارەکان بوون.
لە نەهەنگە هەرە ڕووناکبیرەکان بوون.
ئەوانە شمشێری دوانزە عیلم و
قامچی و جەڵدەی ناو کتێبخانە کۆنەکان بوون.
ئەوانە دەمانچە بێدەنگەکانی ناو نامەی ماستەرو
دوکتۆرای ولایەتی فەقیە بوون.

بۆمبی جانتای تەوقیتکراوی
دیبلوماتە گوڵ بە یەخەی چاکەت و
هەمیشە دەم بە زەردەخەنەکان بوون.
گورگی کەرەویت لە مل بوون.
ئەوانە ڕم و تیرو شیرو داری حەددو فەتوایانە بوون
جگە لە زمانی کوردی و فارسی
ئەڵەمانی و ئینگلیزیشیان ئەزانی!
ئەوانە تیغی هەژارو ژەنگاویی ئێران نەبوون
هەموویان بە ئاوی زێڕ زاخاو درابوونەوەو
لە ئوتێلی دە ئەستێرەدا دائەبەزین و
کیفەکانیان لە گەوهەرو
سواری ماشێنی یاقووتین ئەبوون!
ئەوانە نامیلکە نەرم و نیان و ساویلکەکان نەبوون
ئەوانە کتێبی ئەستووری تەجلیدکراوی
سەر ڕەفەی ڕقی چەندین سەدە بوون!
ئەوانە هەموویان ڕۆشنبیری کۆلیجی تۆڵە بوون
چەندین بروانامەیان لە زانکۆکانی خوێنی شەڕی
ئێران و عێراق و کوردستان و ئەفغانستان و

بلوجستان و تاجیکستان و مەرگستانی دنیا
وەرگرتبوو!
نا.. نا
ئەوانە ڕیشێکی نوێژکەری سادە نەبوون
عەمامەیەکی ئاسایی سەری منارەکان نەبوون
نا.. نا.. نا
ئەوانە ڕیشیان لە نەسلی یورانیوم و
عەمامەیان ئەتۆمی بوو
کۆمەڵێ بوون لە پەڕە بە پەڕەی (نهج البلاغه)ەوە
تا ئەگاتە سەر پەرتووکەکانی عەلی شەریعەتی و
هەتا تیۆری نیوتن و تیۆری ڕێژەیی ئەنشتاین و
خوتبەکانی (گوبلز)یان وشە بە وشە لەبەر بوو!
حیکایەتی هەموو خوێنەکانیان لەبەر بوو.
سووتان و قەنارەو خنکان و مەنجەنیق و
هەموو خەریتەی فێڵێك و
مێژووی درۆی هەموو جیهان و
هەموو تونی بابایەکی غەدرو
هەموو تاوانیان لەبەر بوو!

مردن ئەڵێ:
بەوەفاترین دۆستی من هەر ئەوان بوون.
ژیان ئەڵێ: هەتا ئێستا
لە دیرۆکی ئازاردانی من و کونکونکردنی جەستەمدا
ئەوان گەورەترین ژمارەی پێوانەییان تۆمار کردووە!
درۆ ئەڵێ:
من باوکی ڕاستەقینەی ئەوانم!
ساڵ لەگەڵ بارانی ئایندەدا هات و
ساڵ لەگەڵ دووکەڵی ڕابوردوودا چوو
ئەسپە سپیەکان
حیلە سپیەکان
غارە سپیەکان
چون گەواڵە هەورو تاڤگەی کەف چڕێنی سپی و
سروودی بەفرو کێڵگەی گوڵ پەموو، هاتنەوە.
ئەسپە سپیەکان لەوسەری ژان و لەوپەڕی کۆست و
لە قووڵایی ئەشکەنجەوە سەریان دەرهێناو هاتنەوە.
ئەوەی لە خەیاڵی شمشێردا بوو
لە تراویلکەی دەشتی قوم زیاتر نەبوو.

ئەسپیە سپیەکان هاتنەوە
ئەمجارەیان لە سیانەوە
بووبوون بە سێ ڕەوی سپی
سێ ڕەو.. لە مۆمی کافووریی.. سێ ڕەو.
سێ ڕەو.. لە سپینداری داگیرساو.. سێ ڕەو.
سێ ڕەو.. لە باڵا ئاوێنەی هەتاو.. سێ ڕەو.
هەتا ئەمڕۆیش، ئەوەتا ڕەو هەتا بێت وەك کەناری
ڕووباری ئازادیی درێژ درێژ ئەبێتەوەو بێ کۆتایی.
لە بەردەمی ڕەویشداو لە پێشەوە (قاسملوو) بە جلی
کوڵاڵەوەو بە سواری ئەسپی ڕووناکیی ڕووی کردۆتە
تاریکایی ڕۆژهەڵاتو ڕابوردووی بەجێهێشتووەو
مردنی بەجێهێشتووەو ئێستاو ئایندە ئەئاژوێ!

2009/5/26

تا ئیستا لە گۆڕستانی "تاڵەسوار"ی سەر بە تەم‌و
مژو خاك‌و خۆڵ ئەرخەوانیدا.. لە سنگی شەقار شەقارو
تینووی ئەودا، درەختێکی ئەفسووناویی کەڵەگەتی
بە خۆی چاو ڕەش، سمێڵ ئەستووری، ناوچەوان پانی
دەم‌و دووخۆش.. درەختێکی پەل‌وپۆداری پڕ لە جریوەو
جووکەی هەمیشە نیگا تەڕ.. درەختێ بەردەوام
لە کڕنووش بردندایە بۆ مەزارێکی بە هەیبەتی تەمەن
سی ساڵەی ژێر سایەی.. ئیستا لەوێ.. لە گۆڕستانی
تاڵەسواردا.. لە بێدەنگییەکی خوێناویدا.. کە مێژوویەکی
برینداری تێدا ئەزرنگێتەوە. سەدای عەشقێك ئەبیسترێ
کە (با) ئەیهێنێ‌و ئەیباو، بەفر پرووشەی تیا ئەکاو،
شیعر لە شێوەی پەپوولەو پەلکەگیای تەنیادا بە دەم
ئەو سەدایەوە خۆیان ڕائەژەنن‌و لە ڕەوەزێکی ئەوبەریشدا
شەوو ڕۆژ تەوارێك لە شێوەی ژنێکی شین پۆشدا،
حیکایەتی ئەو درەختەو ئەو مەزارە ئەگێڕێتەوە. حیکایەتێ
کە هەر وشەیەکی ئەستێرەیەکی بچووکەو هەر ڕستەیەکی
ڕێگایەکی درەوشاوەی نوێیەو هەموو هەناسەیەکی هەناسەی

ئەسپێکی ڕامنەکراوی هەمیشە ڕوو لە هەورازە..
مەزارەکەو درەختەکە
دووانەی "ئەڵمانە"ی دایکن
ئەویان ناوی دارتووە سوورەکەی سوڵتانییەو
ئەمیشیان ناوی فوئاد سوڵتانییە!
ئەم چیرۆکە تەمەن سی ساڵە، ئەم حیکایەتی
تان و پۆ چنراوە بە تریفەو هەلاڵە، ئەم عەشقی
ئاوو ئازادییە بۆ یەکەم جار لە بەرەبەیانێکی
زیوینی (ئەڵمانە)وە دەستی پێکرد! ئەو وەختەی
لە ژوورێکی قوڕینی بچکۆلەی پەنجەرە نزمی بە
گوڵە مێخەک داپۆشراوەوە.. گریانی کۆرپەیەکی
تازە لەدایکبوو، لەسەر کاسەوە، گۆمی ئەو بەرەبەیانەی
شڵەقاندو "ئەڵمانە"ی لە مژدەیەکی سەوز هەڵکێشاو هەر هەمان
کاتیش کەڵەشێرێکی پۆپنە ئاڵ خوێندیو تۆزێ لەولاترەوە
ماینێك زاو جوانوویەکی سپی کەوتە سەرزەویو لە ئاسۆیشدا
لە سێ دەری هەورێکەوە گوڵاڵە باری!
کۆرپەیان ناونا دڵ.. واتە (فوئاد)

فوئاد لەو نیشتمانە بچکۆلەیەی ئەڵمانەدا
لەگەڵ گوڵی دارچوالەدا چاوی پشکوت و
لەگەڵ کانیدا گوێچکەی کرایەوەو
دەستی مێژوویەکی زامدار.. مەلاشووی هەڵدایەوەو
بای وەشت رایژەنی و
لە دواییشدا لەگەڵ
بێچووە پڵنگێکدا.. پێی گرت و
لەگەڵ (با)ی کارەساتدا گەورە بوو.
ئەو بۆ یەکەمجار هەژاری و نانی برسی و ئاوی چەوساوە
پرسیاریان لا دروست کردو
زوڵم.. راپچڵەکاندو رەنگی پەڕیوی
کێڵگەکان و جوتیارەکان و باڵی شکاوی
باڵندەکان و پەراسووی دەرپەڕیوی منداڵان
پەیامێکیان دایە دەستی!
هێشتا ئەو و خونچە لە یەك عومردا بوون
کە پاییزی عومری وڵاتەکەی بینی.
هێشتا ئەو و نەونەمام لە یەك تەمەندا بوون

کە زریکەی ژنانی وڵاتەکەی بیستو
قامچی سەر جەستەی ئەوانی بینی.
هێشتا ئەو و یەکەم باڵەفڕێی کۆتر
لە یەك تەمەندا بوون
کە خولانەوەو سووڕانەوەی داڵەکانی
سەر سەری بینی.
ئیتر ئەویش وەکو ئازاری ئەو خەڵکە
باڵای کردو، وەکو قیژەی ئاخو داخو
پەیڤی ڕۆژانەی خوێناویو مانگەشەوی
دەردەداری گوندەکانو دەرمانی گریاوی
نزیك بالیف خەم دایگرتو بەڵام
لای ئەو
خەم بوو بە ترووسکە
ژان بوو بە برووسکە
قیژەکان بوونە سروود
بۆ هەموویشیان
سەری خۆی کرد بە ڕوانگەو

کەوتە ڕێگە!
کەوتە کۆکردنەوەی ئازارەکان
بۆ ئەوەی هەستنە سەرپێ.
سەردانی گوڵە گەنمەکانی ئەکرد
بۆ ئەوەی باسی منداڵانی بێ شیریان بۆ بکات.
سەردانی جۆگەکانی ئەکرد
بۆ ئەوەی پێیان بڵێ تینوەکان لە کوێن؟!
ئەچوو بۆ لای مامزە نەخۆشەکان
بۆ ئەوەی پێیان بڵێ کێ دەرمانەکانیان ئەدزێ.
هەموو ڕۆژێ ئەچوو بۆ لای بەرد
تا پڕ بە مشتی ورەی لێوەرگرێ!
هەموو ڕۆژێ ئەو خەریکی ئەوە بوو
پەیف بگۆڕێ بە هەنگاو
هەنگاو بکات بە ئەزموون و
ئەزموون بکات بەو پەنجانەی
لە نووسیندا ئەبن بە چاو.
هەموو ڕۆژێ ئەو خەریکی ئەوە بوو

زەنگەکانی جەستە وریابکاتەوە
شانەکانی جەستە نوێ بکاتەوە
سەرلەنوێ ژیان دروست کاتەوە.
لەگەڵ گوڵەبەرۆژەدا بوونە هاورێ.
بۆ ئەوەی هەرگیز خۆر ون نەکات.
لەگەڵ زریاندا بوونە هاورێ
بۆ ئەوەی هەرگیز نەچەمێتەوە.
فوئاد وابوو..
فوئاد خۆشەویستی هەمووماڵە بریندارەکان بوو.
فوئاد خۆشەویستی هەموو باڵندە غەمگینەکان بوو.
خۆشەویستی هەموو ماسیە
زەردو سوورو جوانەکان بوو
"چونکە تۆڕەکانی لێ دوور ئەخستنەوە"
خۆشەویستی هەموو گەڵاو گوڵ و
دارستان و بێشەکان بوو
"چونکە تەورەکانی لێ دوور ئەخستنەوە"
خۆشەویستی هەموو قەڵەمە پاکەکان بوو

"چونکە درۆکانی نیشان ئەدان"
درۆی منارەکان
درۆی عەمامەکان
درۆی جبەکان
فوئاد وابوو
فوئاد ئەیوت: من هی خۆم نیم.
سەرم سەری شاخانەو
دەستم دەستی باخانەو
قاچم قاچی گوندانەو
دڵم دڵی گوڵدانەو
چاوم چاوی شارانەو
گوێچکەم گوێچکەی حەقیقەت!
تا ئەهات تەوری ڕیشدار
تیژتر ئەبۆوەو
تا ئەهات ئازار قوڵتر ئەبۆوەو
برین پەل‌وپۆی نوێی ئەهاویشت‌و
لەملایشەوە تا ئەهات

فوئاد باڵای بەرزتر ئەبۆوەو
هەنگاوی ئەبوو بە هەنگاوی تیشكو
ڕەنگی بە ڕەنگی شەفەقو
چون لاولاویش لەناو قەدی
مێژووی تازەوە ئەئاڵا!
مێژووی تازە.. مێژووی هەستانەوەی ئەسپەكان بوو
هەستانەوەی كێڵگەكان
هەستانەوەی تاشە بەردەكان و
هەستانەوەی شەقامەكان و
هەستانەوەی ژنەكان!
تاران پەچەی بە درەخت گرتەوە.
عەبای دا بەسەر ئاوداو
جبەی كردە بەر جادە.
عەمامەی كردە سەری باخچە.
بەزۆر ڕیشی بە گۆرانیی هێشتەوە
كراسیشی كردە بەر شیعرو
مۆسیقای بێوەژن كردو

ژیانی کرد بە پرسە!
تاران بە دەم کەسەوە پێناکەنێ.
بە دەم مەرگەوە نەبێ.
ئەو خۆشیی لە هیچ نابینێ
لە مەرگ نەبێ.
ژنی ئەو کوڕی ئەو کچی ئەو
هەموویان ناویان هەر مەرگەو
ئەوەی لەوێ لەدایك نابێ ژیانە.
ئێستا فوئاد سوڵتانی‌و ئاینده
قۆڵیان لە قۆڵی یەك دایە
ئێستا فوئاد سوڵتانی‌و مۆسیقا
لەناو شیعرا بوون بە چرا.
پەنجەی ئەو و پەنجەی باران
هەریەك پەنجەن.
سەری ئەو و سەری هەتاو
هەریەك سەرن.
قاچی ئەو و قاچی ڕێگا

هەریەك قاچن.
لە ئیستەدا تۆ بە ئاستەم فوئاد سوڵتانیو
ڕووبارێ لە یەکتر جوێ ئەکەیتەوە،
لە ئیستەدا تۆ بە ئاستەم فوئاد سوڵتانیو
ئازادی لە یەکتر جوێ ئەکەیتەوە.
ئیستا ئیتر فوئاد سوڵتانی بووە بە "با"
لە هەموو شوێنێکەو لە هیچ شوێنێکیش نییە.
لە یەك وەختا لە مەریوانەو لە قەندیل.
لە یەك وەختا لە جادەکانی تاراندا
پیاسە لەگەڵ قەسیدەیەکی شاملودا ئەکاتو
هەمان ساتیش لەبەردەرکی سەرای سلێمانی
لەگەڵ (بێکەس)دا ئەدوێتو
بۆ ئەو سەفەری ناو بەفرو بەستەڵەکە
شیعرێکی ئەو وەکو پاڵتوو لەبەر ئەکات.
ئیستە فوئاد سوڵتانی بووە بە نان
چۆتە هەمووماڵێکەوە..
بووە بە ئاو ئەخورێتەوە

بووە بە درەخت لە هەموو حەوشەیەکداو
بووە بە پەنجەرەی هەموو ژوورێك و
بووە بە ئاوێنەی بەردەمی ژنان و
بووە بە مەمکەمژی ساوایان و
بووە بە حیکایەت و
دەماودەم ئەگێردرێتەوە.
قەڵەم هەموو وشە جوانەکانی خۆی خۆش ئەوێ
بەڵام وشەی ئازا لە پێش هەموویانەوە.
لە مێژووی ئاخۆران و بخۆراندا..
ئەو دەمەی بە مووی ڕیش پەتی خنکان
دروست ئەکراو لە تارانەوە تا کوردستان درێژ ئەبۆوە.
وەکو ئەوساو وەکو ئێستاش
ئەرزی حەرام بە قەد ئەرزی هەموو وڵات بوو
ڕەنگی حەرام لە هەموو ڕەنگەکان تۆختر و
فەتوای جەلدە. فەتوای ڕەجم
لە گشت پەیڤێك بەرزتر بوو.
لەو دەمەدا بوو

فوئاد هاتە ناو مینرێژی حەرامەوە
سەری ئازادی ژنی کردبوو بە مانگ
باسکی ئازادی ژنی کردبوو بە جۆگەو
مەمکی ژنی کردبوو بە چراو
پرچی ژنی کردبوو بە پردو
ئازاری ئەوانی کردبوو بە پەیام.
من قەسیدەم هێلانەیە
بۆ هەر باڵندەیەکی کوردستان.
من هەرگیز لێم نەپرسیون
ئێوە لە کام ئاسمانەوە هاتوون؟
لە ڕۆژهەڵاتەوە فڕیون یان لە ڕۆژئاواوە؟
پێناسەی باکوورتان لە باڵاتاندا
هەڵگرتووە یان نامەی باشوور
لە دەنگتاندا؟!
من زامێکی کوردستانیم
ئەو خوێنەی لێمدێ
چوورەیەکی هی ڕۆژهەڵاتەو

چووڕەیەکی هی ڕۆژئاوایەو
تیلماسکێکی هی باکوورو
تیلماسکێکی هی باشوور!
ئەو خوێنەی ئیستەیش لەبەرچاوی ئێوە
لە سینەمەوە دێتە خوارێو سەرتاپام
ئەکا بە شەفەقو ئەم هۆڵەیش
ئەکا بە گوڵجاڕی هەڵاڵە
ئەوە خوێنی فوئاد سوڵتانییەو
جەستەی ئەوە لەناو جەستەی منداو
دڵی ئەوە لەناو شیعری منداو
ئەوە هەمان دار هەناری قوربانییەو
لە ناو ڕۆحی مندا ئەڕوێ!
ئیستە لەوێ.. لە ئەڵمانە
هەر لە تێوان دووئاوایی
"بسامو کانیعمەت"دا
بە شەوو ڕۆژ تەیرێکی سەرو گەردن سووری
پەڕوباڵ سپی

دێت و ئەچێ و لەو بەینەدا
بە دەم فڕینی نزمەوە
گۆرانییەك..
بۆ منداڵانی هەزارو خونچەی ساواو
ئاوی جۆگەلەی غەمگین و
قولینەی بەتاڵی نان و
گۆرانییەك بۆ هەتاوی
لەش ڕێ ڕێ بووی ناو زیندان و
گۆرانییەك بۆ نمەنمەی
خەمانی ژنان دەڵێ..
ئەو بەردەوام لەگەڵمانە
دەمێ نووکی قەڵەممانەو
دەمێکی تر وا لە تابلۆی بەردەممانداو
ڕۆژێکی تر
ئەچێتە ناو گوڵدانەوەو جارێکی تر
لەبەر پەنجەرەی ژوورەو لە تەکماندا ڕائەوەستێ و
لە تیوانی ڕێزە ڕێزەی بارانەوە

خەیاڵێکەو دوور ئەڕوانێ.
لەگەڵمانە.. وەکو هەوا.. لەگەڵمانە!
ئەو وەختەی سواری فڕۆکەو کەشتی ئەبین
لەویاندا ئەو پەروانەیەو
لەمیاندا ئەو چارۆگەیەو
لەمێژووشدا.. هەموو جارێ
ئەگەر کورسی بەرامبەرو
تەنیشت چۆڵ بێ
وەکو خەونێ پەیدا ئەبێ و
بە هێمنی دائەنیشێ!
لە هەر کوێ بین.. ئەو لەوێیە
لە ئاوێنەدا کە سەیری خۆمان ئەکەین
ئەویش دێتە پشتمانەوەو ڕائەوەستێ و
سەیرمان ئەکاو پێئەکەنێ.
وەختێ کە چەپکەگوڵ ئەکڕین
ئەو هەمیشە گوڵێکیانە.
لە تیڤێدا هەمیشە ئەو لە ئازاری

ناو دنیادا ئەبینین و
ئەو کەناڵێکی بۆ نییەو
لە گشت کەناڵێکی جوانی چاودا
وێنەی دیارە.
وەختێ ئەچینە دەرەوەو
دەستی منداڵەکان ئەگرین
ئەو یان بووە بە نوقڵی ناو گیرفانیان و
یاخود بوە بەو جادەیەی
درێژ درێژ ئەبێتەوە بەرەو کازیوەی زیوینی
ئایندەیان.
ونمان ناکاو ونی ناکەین
لە هەر کوێ بین ئەو دێ و دەماندۆزێتەوە..
ئەگەر بچینە ماڵێکی سەقزەوە
لە نەخشەکانی مافووری سەر دیواردا
بۆتە شاهۆیەک و ئەفرێ.
ئەگەر بچینە کۆنسێرتێ
خۆی ئەگۆڕێ بە کەمانچەو

بە شمشاڵو یاخود بووە
بە مایکرۆفۆن ئەمانبینێو ئەماندوێنێ.
ئەگەر بڕۆین دوور دوور بڕۆین.
هەر لێرەوە هەتا ئۆقیانووسی ئارام
لە پڕێکدا وەکو نەورەسێکی عاشق
پەیدا ئەبێو
بە دەوری سەردا خول ئەخواو
باڵ هەڵئەبڕێ بۆ سڵاوو
لە دواییدا نزم نزم تێئەپەڕێ!
گەر بچینە ناو برینە ڕەشەکانی
کەرکووکەوە
ئەو ئەبینین لە تاقێکدا
یان دەرمانە بۆ سووتانو
یاخود بووە بە سەرینی
ژنە نەخۆشێکی ئەوێ!
ونمان ناکاو ونی ناکەین
لە هەر کوێیەکی دنیا بین

له لۆچی هەر زەمانێکدا
ئەو ئەبینین
من بە سەردان چووم بۆ "دارفوور"
لەوێ لەناو قاقڕێکی برسێتیدا..
لەوێ لەناو سەرماو سۆڵەی بێکەسیدا
دوو جار بینیم
یەکەم جاریان خۆی کردبوو بە پارووێک
لەناو دەستی بچکۆلانەی منداڵێکداو
جاری دووەم خۆی کردبوو
بە بەتانیی گرمۆڵەبووی
ژێر دەوارێ!
ئەم ڕۆژانەیش من ئەیبینم
زۆر ئەیبینم، لە جادەکانی تاراندا
لەناو ئاپوورەی زاماندا
خۆی کردووە بە تیلماسکێ
لە قوماشی ناوچەوانی شۆڕە ژنێ و
یاخود لە گەرووی شەقامدا

بووە بە باڵی هاوارێ.
من ئەبینم هەموو ڕۆژێ من ئەبینم
لێرە بێ یان لە هەر شوێنێ
بە بەیانیان دەستی چەپی ڕۆژنامەیەو
بە نیوەڕوان زەنگۆڵ زەنگۆڵی
ئارەقەی ناوچەوانی کرێکارەو
بە ئێواران زەردەی زەردەخەنەیماڵەو
لە شەویشدا.. من ئەبینم
لەسەر ترۆپکی ئاویەر
مانگەشەوی خۆشەویستیو
دارژانی تریفەیە!
ئێستە لەوێ لە گۆڕستانی "تاڵەسوار"ی ئەڵمانە
شاتوویەکی سوور بووە بە حیکایەت خوانی
شەوانەی ئەو دەڤەرەو هەموو شەوێ بەشێك
لە داستانەکەی "فوئاد سوڵتانی" ئەگێڕێتەوەو
بەڵام داستان تەواو نابێ. قسەی ئەو هەموو
کەلایە پەیڤی ئەو هەموو گژوگیایە تەواو

ئەبێ و وەلێ قسەی برینەکانی جەستەی ئەو
دوایی نایە!..
ئێستا لەوێ
ئەو شاتووە سێ لقی خۆی
ئەکا بە سێ شەم و لە یادی
فوئاد سوڵتانیدا یەکە یەکە
بە پەنجەکانی سێ گەڵا دایان ئەگیرسێنێ.
ئێستەش ئێمە لێرە
سێ ئاوێنە. سێ ئینجانە. سێ منداڵ.
سێ کانیی. سێ کۆتر. سێ هەڵاڵە.
سێ شیعر. لە بەردەمی کوڵاڵەیی ئەم
یادەدا ڕیز ئەکەین و لەو کاتەدا کوردستانیش
بە ڕانک وچۆغەیەکی سوورەوە دێت و سێ جار
تەوێڵی ڕووناکی فوئاد سوڵتانی ماچ ئەکات و
لە دواییشدا هەر هەموومان لە سێ ڕیزدا
پێکەوە ئەچینەوە بۆ ئەڵمانەو لەوێ بە دەم
حەیرانێکی بارێزەوە باوەش ئەکەین
بە شاتووەکەی سوڵتانیدا!

سلەیمانی
2009/6/23

ئەو کاتە من حەڤدە بەهاری چاو فرمێسکاوی بووم
حەڤدە سیا ساڵ و حەڤدە کازیوەی تەماوی
هەرزەکارێکی سەرو قژ بژی لانەوازی
یێخەی کراس چرچ و لۆچی سك تێك قوپاو
تازە بەتازە چاوبڕکێم لەگەڵ کچی شیعردا ئەکردو
خەونم بە " جوانی بێ ناوی" گۆران و
پێغەمبەری " جوبران " و
گۆمەکەی "لامارتین " ە وە ئەبینی
کەئەوم ناسیی بۆ یەکەم جار
لەسەر تەختەی شانۆو لەماڵی "پیسکەی تەرپیر"ی
" مۆلێر " دا بەیەکتر گەیشتین ..
ئێمە بنچك و ئەو دارتوویەکی پڕ
ئێمە تازە لەباڵەفرێدا و
ئەو دەوران دەوری شەقژنی بوو
وتیان : ئەوتا " ڕەفیق چالاك " !
پیاوێکی ئەسمەری قیت و زیت .. دار زەیتون بوو .
لەشێکی باریك و سووك و بزۆز .. ئاسك بوو ئاسك .

تەوێڵ پان و چاوشینێکی بریسکەداری درەوشاوە
وەك دوو کوژەکەی بەرخۆر
قژ کورت ، بەدووکەڵی جگەرە
ناوەندی پەنجەکان زەرد زەرد
جێ بەخۆنەگر . بەدەم و پل و قسە دانار دانار
لەرەی دەنگێکی سیحراویی کاریگەر
کە گوێ گری ئەخستە ژێر ڕکێفی
خۆیەوەو متی ئەکرد ...
وەك لەو دەنگەدا جادوگەرێ هەبێ
وەك لەو گەرووەدا
ژێ یەکی ئەفسوناوی هەبێ ..
وزەیەکی ماندوو نەبووی
هەمیشە سەماکەر وەك
ئاگرێکی بەکڵپەو بڵێسە
سەماکەر ..وەك قەڵبەزەی شەتاو
ئاڕووشە .. وەك سمۆرەی نێوان پەل وپۆی داران .
دەم ودوویەکی نەپساوەی تێکەڵ بە گاڵتەجاڕی و

پێکەنینێکی بەرز و سەرێکی وەك بەهەرچواردەوردا
بسوورێتەوە  وابوو .. ، بەرلەچوارساڵ :
ئەسپی " سیاسەت " گلاندبووی
لەو پەیژەیەوە کەوتبووە خوارێ
زامەکان لەهەناویا هەر داگیرساوبوون و
بەلەشی یادگارەکانیەوە  هەرمابوونەوە ..
بەڵام ئەو لەئەسپێ زیاتری هەبوو
لە پەیژەیەك زیاتری هەبوو
لە ڕێگایەك زیاتری هەبوو
لەپەیامێکیش زیاتری هەبوو ..
ئەو قەڵەمەکەی ئەسپێکی کەحێلەی
چوارپەل سپی بوو ،چوارپەل ئاگر ..
لەدەمی ئەو قەڵەمەوە ئاوێکی ڕەوان ، بێ گرێ و گوڵ ،
ئەڕژایە ناو جۆگەی بەهرە  و  داهێنانەوە .
پلووسکی کۆساران بوو ، ئەو قەڵەمە .
وشەکانی مێوژە ڕەشکەو
تامیان وەك باسووق و گەزۆ و

مەست و نەست

خۆشاوی کوردەواری وابوو .
کە ئەینووسی ئەتوت :
دەرگەزێنی " سلەیمانی" بە گوێدا ئەچرپێنێ و
" مامەیارە " لە تەکیایەو
" ئەحەی کرنوو "شتی ئەهێنێتەوە بیرو
" کۆێژە " لە سیحری چیرۆك و مێژووی
خۆی پێ ئەبەخشێ .
چەندین زنەی بەهرە لەوسەرەوە هەڵ ئەقوڵێن .
درەختێکی تەلیسماویی بوو !
لەیەك کاتدا سێوە لاسوورەی پەخشان و
هێشووە ترێ ی ڕەزی دەنگ خۆشی و
گوڵە لاولاوی نواندن و
گوڵە بەڕۆژەی ڕۆژنامەنووسی ئەگرت .
لەیەك کاتدا ..خوڕەی چەم و قاسپەی قەدپاڵ و
ڕەنگی ئاسۆو ، شەپۆلی چیرۆك و
بۆنی مێخەك بەندی کچی دڵدار و
شەماڵی بەردەم مایکرۆفۆن بوو .

ئەوەندەی گلۆلە بلێسەیەك .. وریا بوو .
ئەوەندەی لاوك گەرم بوو
ئەوەندەی حەیران نیان بوو
هێندەی مامزێکی چاوشینیش سرك بوو
لەسەرو دەمێکدا کەئەم شارە هێشتا
وەك کیژی شەرمنۆك ..لەبەردەم هونەردا و
لەسەرشانۆ بە(ماتماتوولەوە)* .. نزیکی :
ئازادی ژن و سەربەستی ڕەخنە ئەکەوتەوە
نزیکی ژیانی داهێنان و سنوور بەزاندن ئەکەوتەوە
ئەو چالاکانە هات و چارشێوی
دەم وچاوی شانۆی لاداو پەنجەی کرد بەچاوی
تاریکی کۆمەڵایەتیدا و
مۆمی لەناو ویژدان و
لەسەر ناوچەوانی ئەو تەختە پیرۆزە
داگیرساند ..
چالاکانە هات و بوو بە
سروودی ڕاپەڕین .

چالاکانە هات و بوو بە
گۆرانی کۆڕی ئازیزان و تێکەڵ بە دوو ئاوان بوو .
ئەسپی سیاسەت گلاندی
بەڵام ئەسپی هونەری جڵەوکردەوە
سواری ئەسپی شانۆ بۆوە ..
چووە سەربالەکانی هەڵۆی سرودو
زەنگی ڕۆژنامەنووسیی لێدایەوە
دانەماو ، بیرنەچۆوە و، خامۆش نەبۆوە .
پەنجەرەیەکی لێ گیراو دە پەنجەرەی تری کردەوە
ڕێگەیەکی بزرکرد بەڵام چەندین ڕێگەی تری دۆزییەوە
چالاك .. یەك کڵاوڕۆژنە نەبوو ، یەك باخ نەبوو
یەك سەرچاوە نەبوو ، یەك بەهرەیش نەبوو .
چالاك .. دەنگ ورەنگ و و بۆن و بەرامەی
وڵاتی  هونەر و نیشتمانی جوانکاری و
سەلیقەی پڕ لە وردەکاریی بوو .
زەنگیانە بوو ، ژێی کەمانچەو، وشەی پاراوو
سروودی ئاگراویی و ، ئەکتەرێکی زگماك و ، خەتیبێکی

هەژێنەروو ، قورگێکی تەلیسماوی بوو .
لە "گەلاوێژ " و لە " زەنگی کاروانی پەیام " و
لەلاپەڕەکانی " برایی و برایەتی " یش دا
ئەستێرە بوو ..
کوڕێك ئەوی تیابووبێ ، بەردەوام گەرم بووە
بەردەوام پڕ لە هاژەی پێکەنین بوو .
هەر " سیاسەتیش " پاڵەوانی خۆی نی یە .
هەر " حیزبایەتیش " شەهیدی خۆی نی یە .
کوردستانی شانۆ و ، نیشتیمانی هونەرو ، چیای گۆرانیی و
جیهانی ڕۆژنامەنووسی و ، زەریای زمانەوانیش
شەهیدانی خۆیان هەیە
مۆمی خۆیان هەیە
رابەری خۆیان هەیە
بۆیە بەدڵنیایی یەوە ئەڵێم :
" ڕەفیق چالاك " لە مێژووی سەوزی هونەری کورددا :
دار سنەوبەرێکی هەمیشە زیندووی ئێمەیە ،
قومریەکی چاوشینی وڵاتی گۆرانیی ئێمەیە

زەنگێکی شانۆی ئێمەو
ئاگرداتێکی ژووری کەلەپوورو
تاوسێکی ڕەنگینی بەهرەو
قەڵەمێکی دەم بەگزنگی زمانی کوردی و
گەروویەکی زێڕینی سروودی
نەتەوە یی و نیشتمانیی
ئەم کوردستانەیە .

هەولێر

*ماتماتوولە : حەزەر

* « گوڵە شەست پەڕی بەهرە ( ڕەفیق چالاك ) « ئەم پەخشانە بۆیەکەم جار لە « ڕۆڤار » ی ژمارە (30) ی تایبەت بەو هونەرمەندە گەورەیە بلاوکرایەوە کە نەبوو دواتریش بکەوێتە نــاو دیوانێکەوە یاخود لەچاپکردنەوەی کۆی دیوانەکاندا جێی خۆی بگرێ ، کەچی ســەیر ئەوەیە ئەمەم بەسەردا تێپەڕیوە و نەکەوتۆتەوەبیرم ! ئەمساڵ 2010 وەختێ تەلەفیزۆنی (KNN) ســەردانیان کردم بەونیازەی یادی چالاك بکەنەوە ، منیش گەڕامەوە سەر ژمارە تایبەتەکــەی ڕۆڤار و پەخشــانەکەی خۆم بەرچــاو کەوتەوە و ئەوســازانیم چ هەڵەیەکم کردووە ! بەهەرحاڵ ئێســتایش هەر نەچووە بچێ بۆیە بڕیارمدا جارێکی تر لە ( هەســت و نەست ) دا چاپبکرێتەوە .

ش. ب

2010/10/12

# پلوورەی* زایەڵە

## «چوار بڕای قوربانی
## لە یەك ماڵی کەرکووکدا!»

هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

ئەمرۆ هەموو پەپوولە ڕەشەکانی باخچەی فرمێسکی ئەم وڵاتە،
دوورو نزیك، هاتوون و گەیشتوونەتە ئەم سارای کۆتەڵ و
کۆستە. هاتوون و لە سەرتاپای بە ژان و سوێی کەرکووکەوە
ئاڵاون و ئاوێزانی ماڵ بە ماڵ و کۆڵان بە کۆڵان و گەڕەك
بە گەڕەکی ئەم شاری ڕەنجەڕۆو حەسرەتە بوون. ئەمرۆ هەموو
پەڕەسێلکە بێوەژنە ڕەش و سپییە باریکەلەکانی ئێوارانی غوربەتی
ئەم دەڤەرە، بە دەم خوێندنی مەقامێکی خاوی زەردەپەڕ
لێچۆڕاوی گریانەوە، پۆل پۆل، ئەفڕن و نزم نزم، خۆیان
ئەکەن بە حەوشەو هەیوان و ژووری هەناسەساردی بیست و دوو
ماڵی ئەمڕۆی خەزان پۆشی ئێرەداو بەلام ئاکام لەو ماڵەیاندا
ئۆقرە ئەگرن و لەو هێلانەی کسپانەدا مل ئەکەن بە ژێر باڵیانەوە
کە بە ڕیزو بە سەریەکەوە، لە یەك ساتدا، چوار کوڕ، چوار
برا ،چوار ئەستێرەو چوار پەلکەڕەنگینەیان لە سێدارە درا!.
چوار خەرمانی هەلدراوەی مژدەو،
شا پلیتەی ئەهرەمەنێك.
چوار ئەسپی سووری سروودو
شمشێری ژمارە سی و شەشی مەرسومێکی دۆزەخین.
چوار شمشاڵی خۆشەویستیی و

ئاگری غەزەبی "موعتەسەم بیللا"یەك
چوار دارچوالەی بەهارێکی هەرزەکارو
تەوری دەستی شەوەزەنگێکی عوروبە!.
"ئازاد".. باراتێکی زیوینی گەنج گەنج
کە تازە بە تازە هیوا شکۆفەی تیا ئەکردا.
سالار.. کۆترە شینکەیەکی عاشقی شاخ.
جەمیل.. ئارەقەی هەتاوی سەر گوڵەباخ.
دیرۆکێ بوو پڕ لە هاوارو زریکە، ڕۆژگاری دووکەڵ و خۆڵەمێش بوو.
هەموو شتێ لە چاوەڕوانی مەرگدا خۆیان بۆ خۆیان ڕیزیان بەستبوو.
دادو هەق و جوانیی و ئاشتی ئەو ناوەیان بەجێ هێشتبوو. نە پەنجەرە
لە دەرگا دڵنیاو نە شەقام لە کۆڵان و نە قەڵەم لە کاغەزو
نە پەنجە لە مەچەك و نە مەچەك لە جەستە دڵنیا.. هەموو شتێ
لە دەرزییەکەوە بۆ دیوارو بۆ پلیکانەو بۆ ڕێگا.. بە سەریەکەوە
سیخوڕ بوون.. شۆستە ڕاپۆرتی لە جادە ئەداو جادە لە درەخت و
درەخت لە ماڵان و ماڵەکان لە ژوورەکانی خۆیان و ژووریش
لە یەکە بە یەکەی خێزان..
مێژوویەك لە غەدرو

غەدر لە قەنارەو
قەنارە لە جەللادو
جەللادیش لە مردن!
ئەچمە ناو قوولایی گومانەوە. ئەچمە ناو قوولایی برینەکانی کەرکووکەوە.
ناو خوێنی لەبەر ڕۆیشتووی سەدەیەکەوە. ئەچمە ناو قیژەی ژنەکانیەوە.
ناو کرووزەی ساواکانیەوە. ناو نووزەنووزی پەلکەگیاوە.
ناو گمەگمی برینداری باڵندەکانەوە. لەواندا شیعر بە تیلماسکی خۆرنشین ئەنووسم و لە دواییدا بە سێدارەدا هەڵیان ئەواسم!:
من ئەمڕۆ شیعر بە تاڵەقژی بێوەژنان ئەنووسم و ئەیدەمە دەست (با)ی غەریبان.. ئەمێستا من ئەم پەخشانە بە برژانگەکانی سالار ئەنووسم و پەخشانیش ئەدەمە دەست تریفەی مانگەشەوێکی کۆساران.. من ئەمڕۆ بە پەنجەکانی ئازادو نەوزاد تابلۆیەك ئەکێشم و
ئەیدەمە دەست گەواڵە هەورێکی سەرگەردان.. من ئەمڕۆ سنگی جەمیل ئەکەم بە شانۆی غەدرو لەسەر ئەو شانۆیە شانۆگەری -تاوان- نیشانی ئێوەو نیشانی کەرکووك و نیشانی کوردستان و جیهان

ئەدەم و لە دواییشدا ئەیبەمە بەردەمی قاپیی یەزدان!
چیرۆکێك لە زایەڵەی درەختی بێ نەوا
درەختی بێ نەوایش.. لە نامۆیی و
نامۆیی.. لە بێکەسی و
بێکەسیی لە کەرکووك و
کەرکووکیش لە فرمێسکی بێ کۆتایی دایکان!
من شیعرم ئەو تاڤگانەی نەدیبوو!
ئەو دارهەنارانەی نەناسیبوو.
ناوی کاك "شوکر لەتیف"ی باوکی ئەو چوار سروودەی نەبیستبوو. نازانم دایکیان کام مێرگی میهرەبان بوو. نازانم خوشکیان کام کازیوەی بەربەیان بوو.. من شیعرم کەسیانی نەدیبوو.. بەڵام کوا شیعری من هی شارێك و دووان بووە.. هی قوربانییەك و هەزاران بووە.. شیعری من هەمیشە ئاو بووە بۆ هەموو
هەتاو بووە، خاك و خۆڵ بووە، باران بووە بۆ هەموو.
شیعری من لێرە ئاگری چاڵە نەوتێ بووەو
لە ئامەد بەردی شوورا ڕەشەکەی.

لە مەهاباد شەوقی چوار چراکەی بووەو
لە قامیشلوو پێدەشتی بەرینی ئازارەکەی.
تازە من هی خۆم نیم، ئەم سەرە بوە بە سەری
پەڵـە هەورێکـــی ئاســـمانی ســـلەیمانی‌و ئـــەم گەرووە بـــووە بە شمشاڵێکی
سەر (ئاویەر)و، دەستەکانم بوون بە دەستی دوو جۆگەی
ناو دەرسیم‌و قاچەکانم بوون بە قاچی جوانوویەکی ناو عەفرین.
تازە من هی خۆم نیم. من ئەمڕۆ شێرکۆ نیم. من ئەمڕۆ ئازادم‌و
سبەی نەوزادم‌و دوو سبەی جەمیلم‌و لە نەورۆزی داهاتوویشدا
لەم شوێنەدا ئەبم بە سالار!.
شیعر لە خۆڵەمێش‌و
خۆڵەمێش لە کەرکووک‌و
کەرکووک لە قەقنەس‌و
قەقنەس لە عەشق‌و
عەشقیش لە سێدارەی براکان!
لەو ڕۆژەدا هەموو شەقامەکان تەنیا بوون. هەموو پەنجەرەکان
تەنیا بوون. ئیمام قاسم تەنیاو ڕەحیماوا تەنیاو خودای کوردیش

تەنیا بوو. لەو ڕۆژەدا عێراق بوو بوو بە یەك شمشێری
گەورەو شمشێریش بە دەست گوندێکەوە بوو ناوی "عۆجە" بوو.
لەو ڕۆژەدا، هەموو قەڵەمە جوانەکان دەستگیر کرابوون.
تەنها قەڵەمێك هەبوو کە ئەویش قەڵەمی گیرفانێکی تکریت بوو
مەرسوومێك.. لە بیست و دوو کەوی سەربڕاو.
کەوەکانیش لە قەفەزی سینەی بیست و دوو دایکی
لە سوتماکدا بەجێماو. سوتماکیش لە زوڵم و
زوڵمیش بە ئیمزای گەورەی جەللادان!.
من نازانم کەی ئەنووسم؟! وەکو هەور کە نازانی
کەی ئەبارێ!. من نازانم چ وەخت خەون بە خۆشییەوە
ئەبینم. هەروەك کەرکوك کە نازانێ چ وەخت خەون
بە بەختیارییەوە ئەبینێ
ئەوەتەی ئەم خاکە هەیە
ئاوی نەدیوە پێبکەنێ.
ئەوەتەی ئاویش هەیە
درەختی نەدیوە ئاسوودە بێ.
ئەوەتەی درەختیش هەیە

باڵندەی نەدیوە لەم ئاسمانەدا
دڵنیا بفڕێ!.
لێرەو لەوێ
ئەو هێلانانە زۆرن کە لە بەیانییەکدا
مەلێکیان فڕیو بەڵام ئیتر نەهاتەوە.
ئەو چرایانە زۆرن کە شەوێکیان
چرایەکیان چووە دەرێو بەڵام ئیتر نەهاتەوە.
بەڵام لێرەو لەوێو لە دنیادا
ئەو ماڵانە زۆر دەگمەنو ئێجگار کەمن
کە چوار کوڕو کە چوار برایان پێکەوە
چوار سێدارە لە یەك ساڵدا بیانباتو
بەڵام ئیتر نەیەنەوەو نەیەنەوە!.
1985/5/14

لەو ڕۆژەدا، من لە بەرگەڵوو، لە دەربەندی پێشمەرگەدا
چاوەکانم. دوو پەپوولەی نێو دەوەنو بەر سێبەری
ڕیزە شاخی سەر "دابان" بوون. دەستەکانم دوو لقی
درەختی ئازادیو قاچەکانم دوو ڕەگی ئەستووری خۆشەویستیو

مەشخەڵان بوون. لەو دەمەدا، ژوورەکەم لە گەرووی
بەرگەڵوودا. لانەی پڵنگە شیعر بوو. شەوو ڕۆژ شەهیدان
میوانم بوون. شەوو ڕۆژ سروودم تیا ئەسوتاو گۆرانیم تیا
سەوز ئەبوو.

لە بیرمە، لە بەیانیی 1985/5/14دا
قەڵەمەکەم بە یەک سک چوار شیعری چاوڕەشی
بوو. لە بیرمە شیعرەکان لە یەک ڕۆژدا پێیان گرتو
لە یەک ڕۆژدا گەورە بوونو لە یەک ڕۆژیشدا خۆیان بەستو
چوون بۆ بەرەی بەردو ئاگر. هەر هەمان ساتیش لەو
ڕۆژەدا لە 1985/5/14دا، دوور لە بەرگەڵوو،
بەرەو خوار، لە شاری غەدرا، چوار برای شیعرەکانم.
چوار برای فرمێسکەکانم. چوار برای خەونەکانم
بەرەو پەتی سێدارەکان بەڕێوە بوون.

1985/5/14
لەو ڕۆژەداو لە شاخداو لای ئێمە چوار پەلکەگیا لەبەردەکەی
بەردەمی ژوورەکەمدا خەریکبوو ئەرسکان.
چوار زنە خەریك بوو هەڵئەقوڵان.

چوار جوانۆ لە دەشتەکەی بەردەمی ژوورەکەمدا
غاریان ئەکرد. هەمان کاتیش
لە شاری غەدردا.. چوار ڕەنگم. چوار دەنگم
چوار شنەم خەریك بوو ئەخنکان!.
لە تەماشای گریانمەوە ئەبینم
چوار ئەسرینم، وا بوون بە چوار. ئەستێرە
هەڵئەکشێن بەرەو لای خواو، لەوێوە
بارانی نوور، ئەهێننەوە، بۆ ئێرە.
1985/5/14
ڕۆژێ لە سەعاتی تەم‌و مژو
تەم‌و مژ لە دەقیقەی زوڵم‌و
زوڵم لە چرکەی مەرگ‌و
مەرگیش لە زەمانی تاوان.
2010/5/14
دوای بیست‌و پێنج سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا.
دوای بیست‌و پێنج خولانەوەی مانگی مایس بە دەوری وەرزەکاندا.

دوای بیست و پێنج دەورەی ئەم وڵاتە بە دەوری چاوەڕوانیدا.
دوای حەوت خولی ئازادیی بە دەوری قوربانییەکاندا.
دوای حەوت سووڕی هەڵپەڕکێ بە دەوری لاشەی جەللادا.
دوای حەوت جەژنی نێرگز و حەوت زەردەخەنەی
کەرکوک و حەوت قریوەی شیعری من.
ئەوەتا پۆل پۆل وشە کوژراوەکان گەڕاونەتەوە بۆماڵەوە.
ئەوەتا درەختە سووتاوەکان لە دارستاندا ڕواونەتەوە.
ئەوەتا ڕەوە جوانووە سەربڕاوەکان لە پێدەشتەکاندا
هەڵساونەتەوە.. ئەوەتا.. بیست و دوو چرا کوژراوەکەیش
ژوور بە ژوور داگیرساونەتەوە..
ئەوەتا هەر چوار کۆترە شینکەکەی ماڵی "شوکر لەتیف"یش
لەسەر سێدارەوە باڵیان گرتۆتەوەو هاتوونەتەوە
نێو هێلانەکانی دڵان!.
2010/5/14

ئەوە ئازادە.. بووە بە جانتا بچکۆلەکەی
کۆڵی ئەو کوڕە حەوت ساڵەیەی هەموو ڕۆژێ
لەو شەقامەوە ئەپەڕێتەوە بۆ قوتابخانەکەی!

ئەوە سالارە.. بووە بەو كانييەى هەموو ڕۆژێ
لە ئاوە ڕەوانەكەى خۆى ئەدا بە مالاّنى ئەو گوندە!.
ئەوەيش نەوزاد، بووە بەو دەغڵەى
لەو بەرمانەوە "با"ى خۆشەويستيى كەروێشكەى تيا ئەكا!
ئەوەيش "جەميل"ە.. بوو بە قەڵەمى ئەو شاعيرەى
لە ژوورێكى سپيكەڵەى ڕەحيم ئاوادا بە ناو عەشقدا پياسە ئەكا!
ئەوەيش باوكيانە بووە بەو پەڵە هەورەى
ماچى ئەو لوتكانە ئەكاتو لە دواييشدا وردە
وردە دائەبەزێ بەرەو ئەم بنارە
ئەوەيش دايكيانە
بووە بەو مانگەشەوە غەمگينەى
هەموو جارێ بەو سەرەوەو لەم وەرزەدا
تەماشايەكمان ئەكاتو بەرلەوەى ئاوابێ
دوو فرمێسكى زيوينمان بەسەردا ئەڕژێ!.
ئەوەيش منم بەرامبەرتان
بووم بە ئاوێنەى عومرتان.
ئەوەيش منم.. وەك ئەمبينن

هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

سەرم بووە بە کەرکووك و
چاوێکیانم بە ئازادو
ئەویتریان بە نەوزادو
دەستی ڕاستم بە سالارو
دەستی چەپم بە جەمیل و
لە دواییشدا فەرموون ئەوە دڵەکەم و
دەری دێنم و ئەم شیعرەی تێوە ئەپێچم و
هەڵی ئەدەم بەسەرتانداو
من دڵنیام لە دوای خۆیشم
ئەویش ئەبێ بەو نەورەسە سپی و سۆڵەی
بۆ یەك چرکەیش
ئاسمانی خۆشەویستیتان جێ ناهێڵێ!

2010/5/5

من لە هاورێ نزیکەکانت نەبووم. وەلێ دووریش نەبووم،
نە وەك کامێرا لە تەکتا بووم و نە وەك هەندێ رەخنەیش لێتەوە
دوور بووم. بەڵام هەمیشە تاڵە پرشنگەکانی هونەرو شیعر
رۆحـــی هەردووکمانی ئاوێزانی یەکتر ئەکرد. هەردووکیشـــمان لە
بەردەمی
یەك قیبلەی عەشقی مەزندا پێکەوە ئەنووشتاینەوە ئەویش کەرکووك
بووا.
بە کورتی لە یەك ون نەبووین چونکە نە شیعر چاوی تۆی
بەجێ ئەهێشت و نە شانۆیش دڵی من. بەڵام نە هەموو شیعرێك
خۆی ئەکرد بەو چاوانەداو نە هەموو شانۆیەکیش ئەهاتە ناو ئەم
دڵەوەا. خولیاکان و خەونەکان و پرسیارەکان زۆر بوون. لە ناو
هەموویشیاندا (نوێخوازی) مەراقێکی داگیرساو بوو. تۆ لەو جەستە
بزۆزانە بووی کە بۆ دۆزینەوەی جووڵەیەکی نەبینراو یان گرتەیەکی
ساتەوەختی کامێرایەك،
کە پێشتر پەی پێ نەبرابێ، دانەئەسکنای،
هەنگێکی بێ ئارام و مەکۆی تەونێ بووی لە نەخش و نیگاری
تان و پۆ دانەئەبرای!. غەدریان لێ کردیت، ئەو وەختەی
هەندێ لە هاورێ بەدەکان ئەیانویست جێپەنجەت لەسەر جەستەی

تەختەی شانۆو لە گلێنەی کامیراکانی ئەم شارەدا بسڕنەوە.
غەدر بوو.. غەدر لە خۆشەویستیی تۆو سلەیمانی.. غەدر بوو لە
ڕەنگی تازەو لە هاواری تازەو لە بێوەفایی بەرامبەر جوانیی !.
هەر جارێك تۆم دیبێ
لەگەڵ خەیاڵی پرۆژەیەکی هونەری
نوێدا.. تۆم دیوە.
حەزت ئەکرد.. لە کەس نەچی لە خۆت نەبێ.
حەزت ئەکرد.. لە شتە بچووکەکانەوە، لە هێماو دەستو
پەنجەی وردی ئەوانەوە بەرەو شتە گەورەکان هەڵکشێی
بۆ نموونە لە نووکە دەرزییەکەوە.. بەرەو نووکی ئەستێرەیەك
لە دەفتەرێکی بچکۆلەی بەرباخەڵەوە.. بەرەو لوولە تۆماری
داستانێ.. لە چۆلەکەیەکەوە بۆ لای هەڵۆیەك.. لە
ئاماژەی گەڵای درەختەوە.. بۆ لای وزەوزی ڕاستەوخۆی
دارستانێ!.
لە بیرمە جارێکیان چووینەوە ماڵی خۆتان. ئەو ژوورانە لە
ژووری ئاسایی ماڵانی ئاسایی نەئەچوون. لە هەموو شتێکدا، شتێکی
هونەری: چاوێ، دەستێ، دەمامکێ، گەردنی پەیکەرێ، تابلۆیەکی
تەواونەکراو، نیوەگریانـــێ، نیوەپێکەنینـــێ، قەرەباڵغییەکی کتێبو

کاسێت، هێمنی جووتێ ماسی عاشق، لەولاوە پایپێك، لەولای ترەوە پۆستەری شانۆنامەیەك کە لە پاش چەند ساڵ هێشتا هەردەم بە زەردەخەنە تەماشای ئەکردین. بۆنی مێخەکبەندێکی هەڵواسراو. بۆنی ریشی ئەپسن و بۆنی ملیوانەی کراسەکەی بەری شکسپیر، چاوی گەشی ژێر چاویلکە بازنییەکەی چیخۆف و لەولای ترەوە وێنەی سێ منداڵی لارەملی گەرەکێکی برسی کەرکووك.. ئەوانە هەموویان بواریان بە دەم نەئەدا بۆ قسەو تەنها چاوم لە هاتووچۆی ناو ئاوێنەکانی ئەواندا بوو. لە بیرمە جارێکی تریش، بە هۆی شیعرێکمەوە کە خانمێکی گۆرانیبێژی باکوور وتبووی، تۆیش کاری دەرهێنانی تەلەفزیونیت بۆ ئەنجام ئەدا.. هاتیت و منت لەگەڵ خۆتدا برد بۆ گردی سەیوان و لەوێ لەناو ئەو دارستانی کێلانەدا لەسەر قەراغی گۆڕێکیان منت داناو تەمسلێکت پێ ئەکردم کە نەم ئەتوانی بیکەم، بەڵام ئیتر هەرچۆنێك بوو خۆم و پەرە کاغەزی پەرش و بڵاوی دەوروبەرم و قەڵەمی نائارامی نێوان پەنجەکانم.

شتێکمان کرد.. ئەمزانی بە دڵت نییەو وەلێ نەشت ئەتوانی بە سەعاتێ بم کەیت بە ئەکتەر.. کە هەڵسام و خۆم تەکاندو پێکەنیم و پێکەنیت پێت وتم: تۆ بۆ هیچ شتێکی تر درووست نەبووی جگە لە شیعر.. چەندین جاری تریش.. مێزی هەمیشە گەش و مەستی شەوانی

خۆشەویستیی.. لەگەڵ یارانی تردا.. لە دەوری ماشقەکانی شیعرو شانۆو ڕۆمان و چیرۆك کۆی ئەکردینەوە.. شەلاڵ بە وشە، شەلاڵ بە وێنە، شـەلاڵ بە شـانۆنامەیەکی تازە.. پاراو بە تریفەو زەردەخەنە، سەرگەرم بە بادەو قسەی بێ پەردەو.. تا هەڵکردنی (با)ی توندی ڕەخنە..

یەکتریمـان ئەبردو ئەهێناو لە پڕێکدا شـنەی دێرە شـیعرێ خاوی ئەکردینـەوەو توورەبوونمان بیرئەچۆوەو هەموومـان ئەبووینەوە بە منداڵ و بە پەپوولەو شەقامی دوای نیوە شەویش ئەبوو بە باخچە..

کۆچەکـەت کۆچێکـی بێـوادە بوو! هـەر وەك ئـەوەی تۆ بەلای تاڤگەیەکدا تێپەڕی و دوای دەقیقەیەك بڵێن.. تاڤگەکە مرد!

هەروەك ئەوەی.. تۆ ئیسـتا دەسـتت لەناو دەستی شانۆیەکدا بێ و هەرکە چوویتە دەرێ بێن و بڵێن شانۆکە مرد.

کۆچەکەت کۆچێکی خێراو بە پەلە بوو

وەك ئەوەی.. تۆ پێش چرکەساتێ.. باڵندەیەك گۆرانیت بۆ بڵێ و لە پڕێکدا بێن بڵێن باڵندەکە مرد..

کۆچی لە ناکاوو هەوری بە باران و خەیاڵی شاعیرانەو گرتەی خێرای کامێرایەك و پەیدابوونی لە پڕی خۆشەویستێك و

ونبوونی لە پڕی تیشکێك و هاتنی لەناکاوی کارەساتێك و ڕۆیشتنی لە

ناكاوی هیوایەك.. هەموویان لەو سەرئەنجامەدا لە یەكتری ئەچن.
تۆ چەندین گەواڵە هەورت لەگەڵ خۆتا برد.. كە هێشتا نەباریبوون..
تۆ چەندین شانۆنامەت لەگەڵ خۆتا برد..
كە هێشـــتا نەكەوتبوونە جووڵەو گڕوگاڵ. چەندین خۆزگە كە هێشتا شكۆفەیان نەكردبوو..
چەندین گریان كە هێشتا فرمێسكیان نەڕشتبوو..
چەندین قەڵەم كە هێشتا پێیان نەنووسرابوو.. بەڵام تۆ دوو یادگاری گەورەت لە دوای ئەو كۆچە بەجێهێشت كە لە ناو ماندا بوون
بە دوو ئاوێنە، بە دوو ڕووبار، بە دوو قەسیدە، یەكەمیان: ئەو شەقامی هونەرو كامێراو شاشەی تەلەفزیۆن و شانەی ئەكتەرانەی كە بەردەوام ئەبزوێن و ئەبەخشـــن و كۆتاییان بۆ نییەو لێرەیش نەبیت وەك لێرە بیت هەر وایە.
دووەمیـــان: خاتـــوو (چیمـــەن)ی هاوســـەرت، ژنـــە میهرەبـــان و سەلارەكەت.
كە بە دەستێك تابلۆكانی پڕ ئەكات لە ڕەنگی وەنەوشەو هەنسك و لە ڕەنگی تەنیایی و بە دەستەكەی تریشی باوەش ئەكات بە ملتاو ئەلبـــووم و كاســـێت و پۆســـتەرو گوڵی كـــراس و ڕیشـــاڵی ملپێچ و قەڵەمەكانت ماچ ئەكات.

هەست و نەست

ژنێك لە تریفەی غەمبارو لە چیمەنی سەوزی فرمێسك و
ژنێك لە دوا تیشكی خۆرنشین و
سەروقژێك لە ڕنووی بەفری تاریكی و
ئاوازێك لە ڕەنگی كۆچ و غەریبی و
هاتووچۆیەك لە پەپوولەی ڕۆحسووتاو!

هاوسەرەكەت، هاودەمەكەت، هاوكەركووك و
هاونامۆیی و هاورووناكی و هاوخەمەكەت
هەموو جارێ لە پێشانگایەكدا تۆ ئەكا بە ڕەنگێكی باڵدارو
بە هێڵی ئاسۆیەكی برینداروو یاخود بە كۆچێكی ڕەنگ
خۆڵەمێشی ئەودیوی دنیایەكی نادیار..
هەموو جارێ تۆ دێنێتەوە ناومان، تۆ لە قژیا
ئەبینینەوە، لە سێبەرەكەیدا، لە زەردەخەنەكەیدا،
لە چوارچێوەی تابلۆیەكیدا، لە ڕەنگێكی مات و مەلوولیا..
ئەو وەختەی فیگەرەكان ئەبن بە باران
ئەو وەختەی بۆشاییەكان ئەبن بە پرسیارو
خۆشەویستیت بە دیدار.
تۆ وەجاخی هاوسەریت

لە شەوچراخ ڕووناکترو لە خودی وەفا خۆی جوانترە.
چیمەن ناهێڵێ گەردی بیرچوونەوە لە پەڕی خۆشەویستیت بنیشێ
چیمەن ناهێڵێ دیمەنی شانۆکانت لەبەرچاوی کورسیەکان و
مۆمەکان و منداڵەکان و گەنجەکان و عاشقەکان.. بڕەوێنەوە.
ئەو ژنە چەند مەزنە
کە فرمێسک و هەناسەو تەنیایی و بیرەوەری و
خەون و تەماشای تاقانەکەتان و ئایندە
لە ناو یەکدا ئەگرێتەوەو ڕەنگێکی نوێی نەبینراویان
لێ دروست ئەکاو بەو ڕەنگەیش گەورە تابلۆیەکی
خۆشەویستی و بیرنەچوونەوەت بۆ ئەکێشێ!
من لە هاوڕێ زۆر نزیکەکانت نەبووم!
هێندەی ئەوان بنج و بێخی دڵ و دەروون و سروشتی
تایبەتیتم نەناسیوە.. وەلێ کوا ئەوە بۆ جیهانی
شیعرو هونەر گرفتە. کاتێ شیعرێکی بچووک یان
یەک دیمەنی شانۆیی ئەتوانێ بمانکا بە دوو هاوڕێی
نزیک!.
هاوڕێم میسری!
دوای ساڵێ لێک دابڕان.. دوای ساڵێ تراویلکە،

هەست و نەست

دوای ساڵێ کسپەو دوای ساڵێ تەمو چاوەڕوانی،
وا ئەمڕۆ بە خۆمو باوەشێ گوڵەمێخەکی پەخشانەوە
هاتووم بۆ لات، بۆ ئەم هۆڵە دڵتەنگە هاتووم بۆ لات.
ببوورە ئەگەر بەر لە خۆت گوڵەکان بدەم بە چیمەن
ئەگەرچی ئەزانم ڕۆحە سپیەکەت ئەمەی پێخۆشەو
هەروەها شیعری منیش..
هاوڕێم میسری!
با تۆیش نەیەیتەوە بۆ لامان!. بەڵام ئێمە هەمووومان
دێین بۆ لات.. یەك لە دوای یەك.. من لەگەڵ دوا
شیعرداو.. ئەو لەگەڵ دوا چیرۆکداو ئەویتر لەگەڵ دوا
ڕۆمانداو ئەویتریش لەگەڵ دوا گۆرانیدا.. دێین بۆ لات
تۆیش هاوڕێم میسری
شانۆنامە تازەکەت ئامادە کە!

2010/5/31

# نائومێدیی

-کورتە شانۆ نامەیەکی شیعریی-

# هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

دەرهێنەر: لە دوای ئەو هەموو تەنیایی و
دیار نەمان و دابڕانە
شەوێك لە پاڵ گۆمەزەکەی (شێخ مارف)دا
"مەحمود جەودەت" لەگەڵ "حیلمی"
بە یەکەوە ڕاوەستابوون
تەماشای "مانگ"یان ئەکردو
باسی مێژووی کۆن و تازەی
کوردیان ئەکرد:
جەودەت وتی:
مەحمود جەودەت: ئەمەوێ سبەی سەرێك بەم
لەناو شارو
نەوەی تازەمان ببینم و
بزانم ئەوان ئەڵێن چی؟!
ڕەفیق حیلمی: دڵنیام هەموو باوەشی
پڕ مێخەك و پڕ گوڵاڵەت
پێدا ئەکەن!
بە پۆل ماچت بۆ ئەنێرن و
لە بەرپێتا، فەرشی ئەوینیان ڕائەخەن!

سڵاوی منت بیر نەچێ!
مەحمود جەودەت: کە هاتمەوە هەر لێرەدا
ئەتبینمەوە!.
چی ڕویدابوو
لە نووکەوە
هەموویت بۆ ئەگێڕمەوە .
دەرهێنەر: سبەی بە گرددا داگەڕاو
هەر ڕاستەوخۆیش
ڕووی کردە بەر دەرکی سەرا
وەلێ ئێجگار سەری سوڕماو
هیچ شوێنێکی نەناسییەوە!.
گەنجێکی دی
جەودەت: ئەرێ کاکە لەم شارەدا
مونەوەر لە کوێ ئەبینرێ؟!
گەنجەکە: زانکۆ.. زانکۆ "دەستی بۆ سەرێ ڕاکێشا"
دەرهێنەر: جەودەت ملی ڕێگەی گرت و
هەرچۆنێك بووە وەختێ گەیشتە پرسگە
جەودەت: من جەودەتم، مەحمود جەودەت!

پرسکە: بەڵام ئێمە تۆ ناناسین؟. ئێ چیت ئەوێ؟
جەودەت: گاڵتە ئەکەن؟! چۆن نامناسن؟. سەردانێکی بەشی
مێژووی
زانکۆ ئەکەم..
پرسکە: ئاخر لە کوێوە بتناسین؟!
جەودەت: ئەوە شوێن پەتەکەی ملم؟! تۆ بڵێی بیرچووبمەوە !.
پرسکە: شوێن پەتی چی؟! بەڵام لەبەر عومرو ڕیشی سپیت
قەیناکا دەی بچۆ ژوورێ!.
دەرهێنەر: هەرچۆنێك بوو مەحمود جەودەت
چووە ژوورێ، پرسیاری بەشی مێژووی کرد، کچێك
دەستی بەرەو لای سەروو درێژ کرد. مەحمود
جەودەت گەیشتە بەردەم دەرگاکەی و کوڵجاڕێ
کچ و کوڕی جوان ڕاوەستابوون.
جەودەت: من مەحمود جەودەتی مێژوونووسم..
مەحمود جەودەی باپیرتان.. مەحمود جەودەتی ئەفسەر
لە لەشکری شێخ مەحموددا. مەحمود جەودەتی مێژووناس و
مێژوونووس ، هەروەها
بێکەس و گۆران شیعریان بۆ وتووم.

مەحمود جەودەتی سەر سێدارەو ئەویش شوێن پەتەکەی
ملم!.. کێ ئەمناسێ؟! تۆ بڵێی بیرچووبمەوە ؟! .
دەرهێنەر: هەموو بێدەنگ بوون. تەنها کوڕێکیان
نەبێت دەستی هەڵبڕی و وتی:
کوڕەکە: بیرمە باوکم جارێك باسی
تۆی بۆ کردووین.
باسی قەڵەمەکەت، باسی
ئازایەتی سەر سێدارەو
باسی نیشتمان پەروەریت!
دەرهێنەر: لێرەدا بوو، ئیتر جەودەت
ئارەقێکی ساردی دەرداو
دوو دڵۆپ فرمێسکی گەرمیش
بە ڕوومەتیا هاتە خوارێ و..
چۆن هاتبوو.. هەر بەو جۆرەیش
گەڕایەوە بۆ سەیوان و چووەوە ناو گۆڕەکەی خۆی!

ئەیلوولی 2010

ئەمرۆ "با" بریندارەو
هەتاوێکی سووری لێ ئەچۆڕێتەوە.
هەموو درەختەکان بوون بە دار هەنار
هەموو ماڵەکان ئەرخەوانین .
هەموو شەقامەکان هەڵساونەتە سەرپێیان .
ئەمرۆ لەرۆژهەڵاتی وڵاتەکەمدا
پۆلێ کۆتری سوور لە زیندانەوە
لەسەر سێدارەوە هەڵفڕیون و
شەقژن .. شەقژن
گەڕاونەتەوە کوردستان !
کۆترە سوورەکان ئەڵێن :
ئێمە گمەی ئەو چیایانەین ..کەناگوێزرێنەوە .
ئێمە گەرووی ئەو شیعرانەین .. کەوشك ناکەن .
ئێمە لەنەسلی ئەو باوهۆزانەین کە نانوشتێنەوە !
ئەمرۆ کۆترە سوورەکان بەئێجگاری گەڕاونەتەوەو
ناچنەوە تاران ! .
کۆترە سوورەکان ئەڵێن :
کۆماری سێدارەی ئیسلامی
خوار خوار بۆتەوەو
بەڵام ئێمە تازە وا خەریکین
لە ملەی بەرزەوە

هەست و نەست

دەست بۆخۆر بەرین و دای بگرینە سەر ئەرز !.
لەم بەیانییەوە
شەقامە هەرە گەورەکەی "سنە"
ناوی خۆی گۆڕی بە " فەرزاد کەمانگەر"
لەم بەیانییەوە
گەورەترین باخچەی" مەهاباد "
بوو بە "شیرین عەلەم هۆلی " و
" مانگ " ی کردە سەر ! .
لەکازیوەی ئەمرۆوە ..
هەموو ئەو منداڵانەی لەدایکبوون
بە مێیەکانیشەوە
ناوی "فەرهاد وەکیلیان" لێنرا !.
لە ئەمرۆوە
لەیەکەم گزنگی سووری بەیانەوە
" مەهدی ئیسلامیان "بوو بەگۆمی "وان " و
"عەلی حەیدەریان" بوو بە "تاق بوستان " ی کرماشان .
کۆترە سوورەکان ئەڵێن :
دەبا کۆماری سێدارە
"سنە" لەسێدارە بدات !
"مەهاباد" بکات بە سلنگەوە !

نەهێڵێ گیا سەوز بێ
نەهێڵێ ئاو هاژە بکات و
نەهێڵێ باران بباری و
نەهێڵێ منداڵەکانمان لەدایکبن !
من ئیتر لەمرۆوە عاشقی چاوانی
"شیرین عەلەم هۆل" یم .
لە ئەمرۆوە هەرچی شیعرم هەیە
ئەیانکەم بە کولی گۆرانیی
بۆبالای " شیرین عەلەم هۆل"ی.
لە ئێستەوە من تالێ لەقژی ئەوم .
لە ئێستەوە
من نینۆکی پەنجەی ئەوم .
لە ئێستەوە من ئیتر ئەبمە ئەو جووتە پێلاوەی
کەبۆدواجار لەپێی کردوو
پێوەی چووە سەر سێدارە .
لە ئێستەوە
من بازنی بە جێماوی دەستی
"شیرین عەلەم هۆلی" م .
گوارەی بەجێماوی ئەوم .
خەونی بەجێماوی ئەوم .
من ئێستە بووم
بەجانتا بچکۆلانە دەستیەکەی

" شیرین عەلەم هۆلی"
بەشانەی قژی و
بەئاوێنەی تەماشای و
من ئێستە بووم
بەدواتیکە نانی بەجێماوی و
بەدوا نامەی نیوە شەوی و
من ئێستە بووم
بەخۆلی ژێر پێلاوەکەی
"شیرین عەلەم هۆلی"
کۆترە سوورەکان وا ئەڵێن :
کۆماری سێدارەی ئیسلامی
ئەوەی ناتوانێ هەرگیز هەرگیز
هەرگیز لەسێدارەی بدا
ئایندەیەو ئازادی ! .

سلێمانی

سەرەتاو کۆتایی 2010

* دوابەدوای لەسێدارەدانی ئەوپۆلە ئازادیخوازانەی رۆژهەڵاتی کوردستان ، پارچە پەخشانێکم نووسی ، لەراستیدا لە رووی هونەرییەوە بەشێکی زۆری قسەی ئاسایی بوون و بەدڵم نەبوون بەڵام لەلایەن خەڵکی کوردستان و بەتایبەتی رۆژهەڵاتی کوردستانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکرا، بەم دواییە جارێکی تر گەرامەوە سەری و هەندێ دێری ئەبێ ئەوانیترم گۆڕی ، بەڵام هێشتا بەلای خۆمەوە شایستەی ئەو قوربانیانە نیین ، دیسانەوەلەرووی هونەرییشەوە هێشتا هەر نزم فڕە وەلێ بە بەراورد لەگەڵ یەکەم دەقدا کەمێك بەرزتر بۆتەوە !

ش. ب
کۆتایی 2010

محێدین زەنگەنە

مانگە شەوی ناو باخی پڕتەقاڵ؛

هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

ژوورەکەم پڕە لە دیاریی.
لە کۆمێکی "زوریخ"ەوە
چاکەتێکی شینی کاڵم بۆ هاتووە.
لە تەمێکی لەندەنەوە
کراسێکی خۆڵەمێشی و
لە شەقامێکی زەیتوونیی "پاریس"ەوە
پانتۆڵێك و
لە باخچەیەکی ئۆسلۆوە
بۆینباخێکی گوڵ گوڵی.
ژوورەکەم پڕە لە دیاریی
خۆرنشینێکی هاوڕێم، ڤیەننایی
قاپێ شەرابی بۆ ناردووم.
لە مۆسکۆوە کڕێوە بەفرێکی دۆستم
جووتێ گۆرەوی ئەستوورو
زریانێکی قوتبی ژوورووە
جووتێ دەسکێش و کلێتەو
شەپۆلێکی زەریای سپیش

پەرداخێکی کریستاڵی.
ژوورەکەم پڕ بوو لە دیاریی
بەڵام ئەمڕۆ زۆریم بەخشین
وەختێ لەناو باخی لیمۆو پرتەقاڵی
باقووبەوە
"با"یەکی نارنجیی هات و
دەست بە خەنە لەگەڵ خۆیدا
پڕ بە هۆڵەکانی شانۆ
بۆن و بەرامەی (پرسیار)ی بۆ هێنام و
عەتری گەردنی ڕۆمان و
عەتری قەڵەمی زەنگەنە!
ئاخ!
مەرگی گوڵەکان ئەوەندە زۆر بوون
مەرگی بارانەکان ئەوەندە زۆر بوون
پاییزم کرد بە شیعرو کەچی هێشتا لە دڵما ئەوەڵی خەزان بوو!
ئاخــر من قەڵەمەکەم لــە قەلەباچکەیەکی باریکەلــەی بێ ئۆقرە
ئەچێ

که له کۆستێکەوه بەردەوام بەرەو کۆستێکی تر له
هەڵفریندایه!. وەلێ هەندێ خۆرەتاوی گەمژە داوای
ئەوەم لێ دەکەن سەوزو سوور بپۆشم‌و به دەم ئەم
هەموو وەرزی زایەڵانەوه منیش گەمژانه پێ بکەنم. ناتوانم
ئەم چارەنووسه ئەزەلییه بگۆڕم. بەڵام ئەتوانم
له کسپەیەکەوه بۆ کسپەیەکی تر شیعرێکی گریاناوی جوانتر
بنووسم!
ئەتوانم هەنسك بکەم به گەڵاو
ئاخ‌و داخ به کزەباو
کینکڵ بکەم به گێژەن‌و
فرمێسك بکەم به ئەستێرەی بچووك بچووکی دەوری شانۆو
جەسته بکەم به ڕێگای درێژی کۆچ‌و واوەیلا.
ئەتوانم
زایەڵه بکەم به باڵ بۆ ڕستەو
کۆتەڵ به ڕۆمان
سەرقەبران بکەم به شانۆی زیندووان.
عەینەکەکەی محێدین بکەم به دوو ڕوانگەی

سەر کەژێکی داهێنان
ئەتوانم کرووزانەوە بکەم بە پەلکەگیای ناو چیرۆك
سەفەرەکانی محێدین بکەم بە چارەنووسی هاتو نەهات
بەلاّم ناتوانم بەسەر بازگەی ئەو ئازارە گەورانەدا
باز بدەم کە ئەم ژیانەیان ئاوێنەبەندی وشەو
تەختەی شانۆ کردووەو ئەکتەرەکانیشی بوون بە هەموومان!.
بەر لە حەفتا ساڵ
بەدەر لە ئیرادەی خاك، بەدەر لە ئیرادەی
دایكو باوكو بەدەر لە مێژوو لە زمانی
باووباپیرانی هەزاران ساڵ
لە یەکەم ڕۆژی خوێندنەوە. لە یەکەم پۆلی قوتابخانەوە
لە یەکەم جوولەی کلۆ تەباشیری سەر تەختەی ڕەشەوە
وشەی کوردییان لە قەڵەمی بەگروگاڵ دابری
لێرەیشەوە یەکەمین مێخیان بە دڵی محێدیندا داکوتیو
لێرەوە پێیان وت:
ئەبێ خۆت لە دەروونی خۆتو لە تەماشاتو
هەستو نەستت جوێ کەیتەوەو ئەوەی ئەتەوێ بینوسی

هەستو نەست
شێرکۆ بێکەس

هەر ئەبێ بە زمانی (ضاد) بینوسی
لێرەوە لەم خاڵە بە ژان و گینگڵەوە
یەکەمین چنگ نانە چنگی. نێوان خودی محێدین و
دەرەوەی محێدین سەری هەڵداو دەستی پێکرد!
بەڵام ئەوەی بە درێژایی مێژووی شمشێری ڕق و کینە.
مێژووی( عەزبا )
مێژووی دیکتاتۆر، مێژووی بەعس لێرە، بە درێژایی و
پانایی و قووڵایی ساڵانی خۆڵەمێشی باقووبە
ئەوەی بۆیان نەکرا ئەوە بوو:
محێدین لە ڕۆحی زمانی کوردی دابڕن
محێدین لە کەرکووک و لە ئاسۆس دابڕن.
محێدین لە ڕۆحی ئازادی و ئاگری نەورۆز دوورخەنەوە.
بەڵێ. محێدین بە باڵی زمانی عەرەبی ئەفڕی
بەڵام ئاسمانەکەی.. هەوای.. فەزای ئیبداعی، هێماو پێناسەکەی
هەمیشە بەرزاییەکانی گیانی کوردەواری و داستانی
پێشمەرگەو سروودی ڕاپەڕین بوو.
لەو مێژووە چاوچاو نەبینەی بەعسدا

هەست و نەست

کەم قەڵەم توانییان وێنەی قەڵەمەکەی محێدین..
بە درێژایی سی‌و پێنج ساڵی هەڕەشە.. سی‌و پێنج ساڵی
چاوی سانسۆر.. ئابڵووقەو گوشار.. لەو توێلە
تاریکەوە سەربەرزو ڕووناك بێنە دەرەوە. وەلێ
ئەو قەڵەمە.. هەر ئەیوت نا.. ئەوەی
گومانێکیشی هەیە: با یەك وشەی ملکەچی محێدینم
پێبلێ یەك ئاماژەی شانۆی زەلیلی بەردەم دیکتاتۆر..
یەك هەرەسی ئەژنۆی
یەك ئاوێنەی درزبردووی هەڵوێستیم
بۆ جوانکردنی ڕووخساری بەعس‌و ئەهریمەنەکەی
نیشان بداتەوە تا ئەوسا سەر داخەم‌و بێدەنگ بم!
محێدین زەنگەنە بە تەنها
قەڵەمی دیاری داهێنانی شانۆو ڕۆمان نەبوو.
بە تەنها هەر ناوێکی جریوەداری عێراق‌و
سەر شانۆکانی قاهیرەو شام‌و وڵاتانی
مەغریبی عەرەبی نەبوو. بەر لەمانە هەمووی
محێدین مرۆڤ بوو

بیرو هەڵوێستو جوانیی بوو
خۆشەویستیی لە کوێ بوایە ئەو لەوێ بوو.
ئاخر ئەفراندنی گەورەیش
بەبێ هەڵوێستی گەورە چی ئەگەیینێ؟!
لە بیرتانە؟!
"ئەزرا پاوەند" چ مەزنە شاعیرێ بوو
بەڵام وەختێ لە دووەم جەنگی جیهاندا
گەرووی بەخشیی بە فاشستو لە ڕادیۆوە
دەنگی خستە پاڵ دەنگی مەرگ. ئیتر ئەزرا
بچووک بۆوە بە ئەندازەی خاڵێکی ڕەش!.
لە بیرتانە "شتاین بێک"
ڕۆمانی کرد بەم دنیایەو
کەچی دنیای لە ڤێتنامدا دایە بەر بۆمبی ناپاڵم؟!
ئەو بۆمبەیشی پیرۆز کردو
ئیتر شتاین بچووک بۆوەو بچووک بۆوە!
تا ئەو شوێنەی بوو بە کورتیلە چیرۆکێ
کزو نەگبەت

گەر نزیکتریش بینەوە
لە بیرتانە؟! (ماغوط)
لە دنیای تازەی شیعردا.. بەو زمانە سیحراوییە
وەختێ بە نەهینیدا شۆڕ بۆوە.. چەند مەملەکەتی دۆزیەوە..
بەڵام وەختێ پرسی کوردیان خستە بەردەم
تووڕی هەڵداو شەقی لە کوردستان هەڵداو
ڕستەکانی بوون بە تێزەی سەر دڵی ئەو..
ماغوط سەری شیعری ئەیدا
لە دامێنی پرشنگی خوا
کەچی وەختێ لێیان پرسی
بۆ ڕزگاری کورد ئەڵێی چی؟!
ماغوط هێندە بچووك بۆوە
نەوی.. نەوی..
تا بووەوە بە ڕمێکی کورتەبنەی ناو قوللەی
عەسری ئەمەوی!
محێدین لە ئاسۆی ئەفراندن و ژیاندا سەرێکی بەرز بوو
تا مردن نە لەو ئاسۆیە بۆوەو

نە ئەو سەرەیشی نەوی کردا
محێدین عیززەتی نەفسی
لە شێوەی کەڵێکی ڕاوەستاو لەسەر دوندێ
نە جارێ ئەو نەفسە بەرزەی کرد
بە مەیموونی بەردەم ڕژێم و
نە دابەزان بۆ هیچ کەسێ
محێدین لە کەنجێتییەوە شانۆی کرد
بە ماڵی یەکەمی خۆی
هەوڵ لە دوای هەوڵی کرد بە پلیکانەی قەڵەمە نەسرەوتەکەی
خۆی، لەو سەرەتایەوە محێدین بە هۆش و گۆشەوە
کەوتە دووی هاواری برینە برسیەکان
لەو سەرەتایەوە تا کۆتایی
پڕ بوو لە خۆشەویستیی هەژاران
هەمیشە پڕپڕیش بوو
لە وردە زریکەی مافی ژنان
پڕپڕیش بوو لە خۆرنشینی خۆشەویستیی شەهیدانی کوردستان
هاوڕێ بوو.. هاوڕێی هەموو جوانییەکی جیهان

تورکومانەکانی کەرکووکی لە گوێچکیلەیەکی دڵیا دانابوو
ئاشوریەکان ماچ بوون لەسەر جەستەی و
کلدانەکان گوڵی لێبووردنی یەخەی بوون و
مەندائیەکان لە کەنار رووبارە سپیەکەی رۆحیا
پەپوولە بوون ئەهاتن و ئەچوون!.
ســاڵاتێکی زۆریــش بــوو، زەنگەنــە، لــە هۆبــەو هــەواری هیچ ئایدۆلۆژیایەکی
حزبی و سیاسیدا تاوڵی خۆی هەڵ نەدابوو. محێدن عیلم خودانی و
دیموکراسی ئیمانی و ئاسمان بنمیچی و هەموو سەرزەمین
ماڵی و ئینتمایشی بۆ پەیامەکەی مرۆڤایەتی بووا.
هاورێم محێدین!
ئەوە من نیم کە ئەڵێم نەمردووی
ئەوە هاواری باخی پرتەقاڵی باقووبەیە وا ئەڵێ
ئەوە من نیم کە ئەڵێم بیر ناچیتەوە
ئەوە شانۆنامەو رۆمان و
چیرۆکە ریزبەستووەکانتە وا ئەڵێن،
ئەوە رەخنەگرێك یان توێژەرێك نییە

كە ئەڵێن تۆ ستوون و كۆڵەكەیەكی
مەڕمەڕی هەردوو دەم و چاوی
پێكەنین و گریان لەسەر نەخشاوی
شانۆی عێراقیت
ئەوە( دیجلە)یە وا ئەڵێ و ئەوە( فورات) ە وا ئەڵێ و
ئەوە (بەرەدا)یەو (نیل)ەو شاخەكانی (عەممان)ەو
ئەوە مەراكیشەو تونسەو
ئەوە (وەهران)ە وا ئەڵێ!.
هاوڕێم محێدین!.
ئەو ساڵانەی دواییش وەختێ تیرۆریستان دۆزەخیان
بۆ باقووبە داخســـتو ژیان ئەوێی بەجێ نەهێشـــت. دەستەیەك لە
هاوڕێ نزیكەكانت
كە من یەكێكیان بووم، سەرمان كردە سەرت، كە باقووبە
لەگەڵ خۆت و ماڵتا بێنی بۆ سلەیمانی. ئەوەیشمان ئەزانی
كە پێویستە سلەیمانیش لە ئامێزی ئەوینی خۆیت بگرێ و
پێشوازییەكی وات لێ بكات كە ئێمە لە بەردەمی شاخی
گۆیژەدا ڕووزەرد نەكا! هەروایش بوو، بە خاوو خێزانەوە

گەیشتنە ئێرەو ئەسپە ڕەسەنەکانی
شۆڕش بە دەم حیلەوەو
باخی گشتی بە چەپکە گوڵەوە هاتن
بە پیرتەوەو شەقامی بێکەس و گۆران و پیرەمێرد گەرم و گوڕو دڵسۆزانە
شانۆنامەکانتیان ماچ کردو لە بنەبانی دڵماندا ئیتر تۆ بووی
بە خانەخوێ و ئێمە بە میوان.. تۆ گەورەتر بووی لە هێنانەدی خەونەکانت
وەلێ جوامێران کردیان و ئێمەی هاوڕێشت هەناسەی
ساردمان بە دیار شانۆکانتەوە هەڵئەکێشا!.
(دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم)یش.. بەو هەموو شەستپەڕو گوڵەمێخەك و
خەرمانەی گۆڤارو کتێبەوە ئاوێزانت بوو.. ئەویش پەنجەرەیەکی
پێشکەش کردی و تۆیش
لەو پەنجەرەیەوە سەرو ملی خۆت کرد بە مۆمێکی کافووری و
بەسەر دێڕەکانی گۆڤاری (سردم العربی)دا ئەگەڕایت و
تۆ مامۆستاو نووسەرەکانی تریشمان شاگردی بەردەستی

تۆ بوون.. لەو ساڵانەی دواییدا ڕۆژە نارۆژێ یەکترمان ئەبینـــی.. خۆشەویســـتیی نێوانمان ڕیاکارانە نەبوو.. ســـادە بوو لە باران و گوڵە کێویلە ئەچوو..
لە دوو لقی درەختێك.. لە پەیوەندی نێوان
شیعرو شانۆ..
ئاخ!
مەرگی گوڵەکان ئەوەندە زۆر بوون!
مەرگی شمشاڵەکان، مەرگی جۆگەکان..
مەرگی هەورو باران و کانیو ڕووبارەکان ئەوەندە زۆر بوون
مەرگی قەڵەمە جوانەکان.. مەرگی ڕەشنووسەکان.
مەرگی گۆرانیو نۆتەکان ئەوەندە زۆر بوون
جگە لە پاییزی خۆم پاییزی ئازیزانیشم قەرز کردو
کەچی تازە سەرەتای خەزانە!
محێدین.. پیاوێك لە دارپرتەقاڵ
ئەو کاتەی ڕەنگی نارنجیی ئەبێ بە پەردەی شانۆو
دیالۆگ ئەبێ بە تەریبەکانی برووسکەی زمانو
ململانێی نێوان عاشقو ڕەقیبان

تا سەر لوتکە هەڵئەگەڕێن و
لە دواییشدا بە ڕەش و سپییەوە گلۆر ئەبنەوە
بۆ خوارێ.
محێدین و محێدین..
ناوێك لەگەڵ هەتاودا شارەو شار ئەگەڕێ و
شانۆیەك لە تەختەی شەپۆلان و
لە ڕۆحماندا دێت و دەچێ.
ڕۆمانێك لە بەفری ساڵانەو
بەسەر یادەوەریتا ئەبارێ.
عیزەتی نەفسێ لە شاخ و
شاخ ئەبێ بە محێدین و
لە دواییشدا
بە پێوە ئەژی و
بە پێوەیش ئەمرێ!.

سلەیمانی
2010/9/12

## حەمە جەزا

## پیاوێك لە دەنگی خۆش و
## دەنگی خۆشیش لە هونەری ئازا!

هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

بۆ یەکەمجار، لە زەمان و ڕۆژگارێکدا. پەنجەکانمان
یەکیان ناسی و، چاومان بەدەم، شەماڵی زەردەخەنەوە
چوونە ڕەشێنەی یەکترەوە، لە زەمان و ڕۆژگارێکدا،
کە سەعاتەکانی لە دەقیقەکانی و دەقیقەکانی لە چرکەکانی
ئەترسان. سەردەم سەردەمی ئەهریمەنی تازە بوو. سەردەمی
ئەژدیها، ئەژدیهای ناو داستان و ئەفسانە نا، نا،
ئەژدیهای ڕاستیی ناو بەغدا. ئەژدیهای ئایدۆلۆژیای
سێ کوچکەی ژەهراوی بەعس، ڕۆژی حیکایەتە خوێناویەکانی
ناو موسڵ و ئەبوغرێب. لەو دەمەدا کە لە سیلەی
هەموو شیعرو گۆرانی و مۆسیقایەکدا، سانسۆرێکی دەست
بە قەمە ڕاوەستابوو. لەو ڕۆژگارو زەمانەدا، ئێمەی پەپوولەو
پەڕەسێلکەو چۆلەکەی شیعرو هونەر، چاومان بۆ ئاسمانێکی
فڕین ئەگێڕاو نەبوون. چاومان بۆ هێلانەی داڵدەو ئۆخژنێ
ئەگێڕاو نەبوون. هەر خۆمان و هەر خۆمان بووین.
لە زەمان و ڕۆژگارێکدا، وەختێ لە ژوورەوەیش دائەنیشتین.
گوێی دارو دیواری ژوورمان، ئەئاخنی، لەو ڕۆژگارو
زەمانەدا، ناوبەناوێ، قسەی خۆش و گۆرانیی تۆ، ئەبووە
جۆرێك لە بای تاسەی خەم ڕەوێن و دڵدانەوە. لەو

دەمەدا، ئاخر ئێمە چیمان هەبوو، جگە لە هەندێ هۆنراوەو
هەندێ چیرۆك‌و گۆرانی، کە ئەوانیش وەکو پۆلێ
لە باڵندەی غەمگین غەمگین سەریان ئەکرد بە ژێر
باڵی یەکتریداو لاملیان لە یەك هەڵئەسوو. زەمانێکی
تاریك تاریك.
وەلێ شاخ نەچووە سەر چۆك‌و
سوجدەی بۆ ئەژدیها نەبرد.
لە خۆڵەمێشەوە دیسان
بازی ئاگر دروست بۆوە.
ڕۆژ ڕۆیشت‌و ڕۆژ هات‌و
کورژنی ئەسپ‌و هۆبەهۆی یاران
لە دەربەندو نزارو کێوەکانەوە بەرز بوونەوە
مۆمەکان لەسەر تاشە بەردەکان
داگیرسانەوە
ئێمەیش لەوێ.. بووین بە شیعرو گۆرانی‌و
باوەشمان کردەوە بە یەکتردا
حەمە جەزا پیاوێك لە ئاوازو
ئاواز لە زام‌و

زام لە گوڵجاڕی شەهیدان و
گوڵجاڕی شەهیدانیش لە دڵی هەموومان.
دوای چەند خولانەوەیەکی تری کورد بە دەوری کۆستاو کۆست
بە دەوری زەویداو زەویش بە دەوری ئێمەدا.. لە بەهاری
ئەو ساڵەدا ئەو دەمەی دەربەندی (بەرگەڵو) بوو بوو
بە دەربەندی نێرگزو یاڵی ئەسپ بە ئاڵای دەم باو، ئەو
دەمەی بەرد پێئەکەنی و سێدارەی دوژمن ئەگریا.. جارێکی تر
لەوێ
لەگەڵ تۆدا لە تیپی شەهید کارزان یەکمان گرتەوە.. دوایی
بە یەکەوە چووینە ژوورە پێنج ئەستێرەییەکەم.. ئەستێرەیەکیان بۆ
تەنیایی و
ئەستێرەی دووەم بۆ شیعرو.. سێهەمیان بۆ ڕۆمان و چوارەمیان
بۆ دووکەڵی جگەرەو پێنجەمیشیان بۆ وێنەکەی دایکم.. ئەوسا
بە چوارمشقی لەسەر بەتانیە سەوزەکە دانیشتین و تۆ داوای
دوا شیعرت لێکردم.. "شیعری خوێناویی" دەست و پل و دەنگ و
ڕەنگی ژوورەکەمی سوور کردو.. تۆیش بووی بە پەلکەڕەنگینەو
باوەشت پیاکردم و ماچ بارانت کردم و کە هەڵسایت شیعرەکەت
لە ئاخێکی قووڵەوە پێچاو خستە گیرفانی چەپی سەر دڵت و

ڕۆیشتی..
حەمە جەزا پیاوێك لە وەفا
وەفا لە بەفری هاوڕێیەتیو
هاوڕێیەتیش لە سنەوبەری چوار وەرزی ساڵ.
تۆ خۆیشت هەر سنەوبەرێك بووی
هەمیشە لە ناوماندا سەوز سەوز ئەتریقایتەوە..
تۆ خۆیشت هەر بالآئاوێنەیەکی ئەوین بووی
هەمیشە لەناوماندا ڕووناك ڕووناك ئەبریسکایتەوە.
تۆ خۆیشت هەر گڤەگڤی سروودێ بووی
هەمیشە لە دڵی ئەو خەڵکەدا ئەتوایتەوە.
تۆ هەر کەناریەکی هونەرمەندی میللیو دەنگ خۆشێکی
لە بەهەشتەوە هاتوو نەبووی، کونجی قەناعەت بگریتو
لە دوورەوە تەماشای بوومەلەرزەی کارەساتەکانو
لە دوورەوە سەیری مێژووی پارەپارەی میللەتەکەت بکەیت
نا تۆ بۆ خۆت لەگەڵ داروبەردا، لەگەڵ باخچەو
شەقامو مالآندا، ناوجەرگەی بوومەلەرزەو تێرینەی
کارەساتەکانت هەڵبژارد تیا بژیت. کەواتە تۆ کەناریەکی
هونەرمەندو هونەرمەندێکی کەناریو ئاوازێکی ئەرخەوانیی بوویت

هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

که لەو شاخانەدا هەڵقوڵایت.
حەمە جەزا
پیاوێك لە گۆرانیو
گۆرانیی لە ژانی هەژارانو
ژانی هەژاران لە کوردو
کورد لە زناری کێوەکانو
کێوەکان لە ورەی پێشمەرگە
دیسانەوە ڕۆژ هاتو چوو. خەم هاتو چوو. خوێن
هاتو چوو. دیسانەوە کورد بە دەوری کارەساتو کارەسات
بە دەوری کورددا سووڕایەوە. ئەمجارەیان لە ڕۆژی حەشرو
قیامەتی ئەنفالدا، جگە لە خواو لە هەندێ عاشقانی خواو لەو
شاخانە، جگە لە گازی ژەهراویی، ئیتر کەسێ نەمایەوە
ئەمجارەیان، هەر یەکێکمان لە ئاقارو پەناو پاسیرێکی نامۆیی
ئەم جیهانەدا گیرساینەوە. تۆ کەوتیتە دانیمارکو من
سویدو یەکێکی ترمان لەودیوی زەریاکانو بەڵام نە شیعرو
نە گۆرانیو نە کەمانچەو نە شمشاڵو نە چیرۆكو نە
تابلۆو نە شانۆنامە نەبرانەوە.. ئەو ڕۆژگارە
دوورەوڵاتی لە ناوەوە خەریك بوو کلۆری ئەکردین.. کە یەکمان

ئەبینی هەموو قسەکانمان گەڕانەوە بوو بۆ لای ئەم شارە..
خەیاڵ نەبوایە ئەمردین.. یەکە یەکەی کۆڵانەکانی ئەم شارەمان
لــە خەیاڵــدا هەڵئەگــرت و قەیســەریمان هەڵئەگــرت و یەکەیەکە
عاشقانی
سلەیمانیو شێتەکانی سلەیمانیو مامەیارەو شاخی گۆیژەمان
ئەدا بە کۆڵداو ئەمان هێنانە سویدو دانیمارکو بە دیاریانەوە
ئەوق ئەبووین.. بەبێ ئەوەی پێی بزانین. لەگەڵیاندا.. هەندێ
فرمێسک بە پێدزکێ لە چاوەوە ئەهاتنە سەر پەڕەی ڕوومەت!.
حەمە جەزا
پیاوێك لە دارسێوی قسەی خۆشو
قسەی خۆش لە سلەیمانیو
سلەیمانی لە ئەحەی کوڕنوو.
ئەحەی کوڕنووش لە مەجلیسی یارانو
لە دەنگی دیلان.
ئەوا ئەمڕۆیش
لە مەهاباد ڕا.. لەوێوە
لەسەر گۆڕی مامڵێوە
نەوەرەسێ هات بۆ سەیوان و لەسەر کێلی

گۆڕەکەی حەمە جەزا نیشتەوەو
دوو ئاوازی تازەی خوێندو
دوو گۆرانیی کرد بە دیاری حەمە جەزاو
ئینجا دیسان هەڵفڕیوە.. هەر لەوێوە
لە بۆکان ڕا
لەسەر گردی ناڵەشکێنێ
لە دوا ماڵی زیرەکەوە
بلوێرێ هات
کیژان دەچنە مێرگوڵانی بۆ ئەم ژەنیو
گۆڕ لەریەوەو
کێلەکانی کەوتنە سەما
ئەگەر ڕۆژێ لەسەر سەیوان
کەوێکی سپیتان بینی
بە چوار دەورا ئەخولێتەوەو
لەبەرخۆوە
شیعرێکی من ئەڵێتەوە
دڵنیابن ئەوە هەر ڕۆحی حەمە جەزایە
بە شوێن ئاوازدا ئەگەڕێ بۆ ئەو شیعرەو

ناڕواتەوە.. بۆ لای خودا
هەتاکو نەیدۆزێتەوەو
هەتا نەیلێ!.
حەمە جەزا
پیاوێکی موتوربەکراو لە دارگوێزی پێشمەرگە
سەرو ملی لە پەنجەرەی هونەرو جوانیو
ژیانی لە مەقامی سەفەرو
پێکەنینی لە بەستەی سەوزو سوری
سلەیمانی.
ئەمە چلە نییە بۆ فرمێسكو
ئەمە چلە نییە بۆ هەناسەی ساردو
بۆ پاییزی لێکدابران
ئەمە ئاپوورەی چڵ گۆرانیی کوردییە
لە ژوور سەرياو
ئەمە وەفای ھاشانەو
وەفای یاران
بۆ ئەو پیاوەی دەنگی خۆیو گەرووی
خۆیو دڵی خۆی دا بە کوردستان!

ئەوانەی ئەو سیاسەتمەدارانەی بە پێوەو بە زیندوویی
نەیان توانی هەموو ڕەنگە جیاوازەکانی ئەم وڵاتە
لەگەڵ یەکدا کۆکەنەوەو نەیان دەتوانی
یەکیان خەن و نەیان توانی یەك ئاڵایان
لێ دروستکەن
تۆ بە ڕاکشاوی و لە تابوتەکەتدا
بە بێدەنگیی هەموویت کرد!
خۆشەویستیی حەمە جەزا
بوو بە دارسێوی عاشقان.. لەم شارەدا
پەنجەکانی حەمە جەزا
بوون بە چڵ و
گۆرانیەکانی بە تەیرو
وشەکانی بوون بە پرژەو
وشە وشەو تنۆك تنۆك
لە دەم و چاومان هەڵپژا.
بەر لەوەی بێم بۆ لای ئێوەو
بۆ ئەم هۆڵە
لەبەر دەرگا

هەست و نەست

دوو قەڵەمی کوڕو کچی گەنجم بینی
قەڵەمی کوڕ لە قەڵەمی کچی پرسی:
باشە ئەم گۆرانییە..
بۆ ئەوەندە خۆشەویستەو لە سەرچاوە؟
قەڵەمی کچ تۆزێ ڕاماو
پەرچەمەکەی لەسەر نیگای لاداو
ئەوسا وتی:
چونکە لە گەرووی میللەتەوە ئەهاتە دەرێ.
چونکە ئازارەکانیو ئازاری ژنانی گەلەکەم
دەستە خوشك بوون.
چونکە باڵی فرینی لە ئاسمانی پێشمەرگەوە هێنابوو.
لەبەرئەوەی وەك گوڵە مێخەكو
خۆشاوو گەزۆو کونجی.. میللی بوو میللی!.
لەبەرئەوەی چون نەخشو نیگاری بەڕەو
کاسەو کەوچکی دارینی کوردەواری
سادە بوو.. سادە
چونکە نەبوو بە تووتی ناو کۆشکی سوڵتان
لەبەرئەوەی نەبوو بە باوەشێنی ژنی سوڵتان.

چونکە بۆ ساتەوەختێ
کەرکووکەکەی دڵخوازی بیر نەچۆوە
لە دواییشدا لەبەرئەوەی
بە جەوهەرو بە شێوەو ڕەنگ و
بە بۆن و بەرامەیش
سلەیمانی بوو سلەیمانی!
هێزی شیعرو هێزی هونەر لە ڕۆحدایە
خۆی هێزێکە لە ئاوریشم و باڵی پەپوولە نەرمتر
لە ڕێزەی باران ناسکتر
ملی شاعیریش لە ملی
چۆلەکەیەك زۆر باریکتر
بەڵام ڕۆژژمێری بەردەم مێژوو
پێمان ئەڵێ:
لە هێزە ئاسنینەکەی
هەموو دەسەڵاتی دنیا
کاریگەرتر!
شمشاڵ چییە؟! ئەگەر بە تەنهاو بە تەنها
بۆ خۆی ژیاو بۆ خۆی ژەنی و

هەست و نەست
شێرکۆ بێکەس

ئازاری قامیشەڵان و دارستانی بەلاوە نا؟!
دەنگی شیرین و خۆش چییە؟! گەر لە ژووری خۆی
قەتیس کاو هەر بە تەنها دارو دیواری ماڵەکەی
گوێی لێ بگرێ و کەسی تر نا؟! باشە ئەبێ شیعر چی بێ
گەر بە تەنها دڵی نووسەرەکەی خۆش کاو لەو بەولاوە
نە [illegible] نە یەك تەزوو لە ناو ڕۆحدا
بەجێ بێڵێ و نە یەك برووسکەو تروسکەو هەر بە تەنهایش
خۆی تێی بگا؟!
ئەسپ بە تەنها [illegible]
ڕووبار بە تەنها لەبەر خۆی هاژە ناکاو
باران بە تەنها هەر بۆ خۆی نابارێت و
باخچە بە تەنها لە بەر خۆی بۆن و بەرامە نابەخشێ و
مانگ هەر لەبەر جوانیی نییە هەڵدێ و
درەخت بە تەنها هەر لەبەر
کەڵەکەتیی نییە ئەڕوێ و
گۆرانیش تەنها هەر لەبەر گوێچکە نییە
وەختێ خۆی خۆشەویست ئەکا
حەمە جەزا!.

دەنگی خۆی دا بە تاشەبەرد لەو شاخانە
قورگی خۆی دا بە جۆگە ئاوی هیلاك و
بە مەزراو رەزی بێوەژن لەو گوندانە
حەمە جەزا
هەناسەی خۆی کرد بە دیاری
بۆ کارژۆلەی ناو دووکەڵ و
چریکەیشی
پێشکەش بە بازی زامدار کرد
لەو سەنگەری نەبەردانە.
لە شاریشدا حەمە جەزا
دڵی خۆی دا
بەو پرچانەی لەماڵەوە زیندانین و
نەغمەی خۆی دا بەو دڵخوازو عاشقانەی
بەو بازن و ملوانکانەی
بە دەستی پیاو
دەستی مێردو دەستی باوك و دەستی برا
بوونە سەرابی خۆڵەمێش لەم شارانە.
هاورێی شیعرم هاورێی خەمم حەمە جەزا!!

بۆ دواجاریش کە بینیمیت -کوێرایی شیعر دائەهات-
من نەم ئەویست لە توانەوەدا بتبینم. بەڵام خۆت داوات کردبووم.
من نەم ئەویست دیمەنی گۆرانییە کەڵەگەت و پۆشناخەکەی
دوێنێم لەبەرچاو بڕەوێتەوە. هاتمە ژووریٚ.. ئاخ. ئاخ
ئاخ.. هەر ئەو ژوورەی چەند جاریٚ شیعرو گۆرانی و مۆسیقا
ڕەشبەڵەکیان تیا گێڕابوو. هاتمە ژووریٚ ژووری ژان و ژووری
حەسرەت. ژووری پاییز. ژووری وەرین. ژووریٚ لە
چاوەڕوانـــی مەرگـــدا. چاوم لیٚ بـــوو پەنجەرەکان بـــە بێدەنگی
ئەگریان. تەماشا شڵەژابوو.
لە بنەبانی سەرەوەیشدا بە دەستە ڕاستدا. خۆت و
ئازارەکەت لەسەر پشت ڕاکشابوون. ئەوەی دیم تۆ نەبوویت.
وێنەی تارماییەکی خوراوی تۆ بوو، مشتیٚ لە چڵ و چێوی پاشماوەی
ئازارو پەیکەری ئێسك و پرووسکیٚ و هیچی تر نا.
چیم دی؟!
مۆمێکی کافووری لە دوا ساتەکانی توانەوەدا. پرتەپرتیٚ
بەر لە کوژانەوەی دوایی. پرتەقاڵێك بە گوشراوی. دوا چۆڕی
تاڤگەیەك. دارسێویٚ بە داڕنراوی. چۆمێکی وشك.
شەقامێکی گەورە بووبێتەوە بە کۆڵانێکی باریك. ستوونیٚ بوو

بێتەوە بە دەرزی. ئەسپێك بچووك بچووك بووبێتەوەو
مێردمنداڵێ بتوانێ بیهێنێو بیبا. قەسیدەیەکی درێژو سەدان وشەو
بەڵام چەند وشـــەیەکی بێ هەناوی لێمابێتەوە.. یان ئاوازێکی درێژ
تەنهـــا چەند نۆتەیەکـــی پەرتەوازەی لێ مابێتەوە. لەســـەر قەراغی
چرپای ئازار دانیشـــتم. نەم ئەویســـت تەماشـــات بکەم بەڵام تۆ ئەو
چاوەی تێت بڕیبووم نەت ئەترووکان. چاوت دەم و لێو زمان و دەنگ
بوو. چاوت شیعرو چاوت گۆرانیی بوو. لاپەڕە بە لاپەڕە سەرنجی
چاوتم ئەخوێندەوە، تەماشای دەردەدارت پێی ئەوتم:
"شـــێرکۆ خۆشـــم ئەوێی، شـــێرکۆ شـــیعرەکەت بیر نەچێ. شێرکۆ
ماڵئاوا"
دیارترین شت لە ڕووخسارتا برۆکانت بوون، برۆکانت بووبوون
بە هەموو ڕوخسارت و جەستەیشت بە پووشی دەم واوەیلا!.
حەمە جەزا
ڕووبارێك لە گیانەڵادا.
باڵەبانێ لە دوا هەناسەیدا.
دەفێك کونێکی تێبووبێ.
کەمانێك ژێکانی پچڕابێ.
پیانۆیەك هەر قاچەکانی مابێتەوە.

هەست و نەست

شێرکۆ بێکەس

عوودێك له جێگەی خۆی توابێتەوەو
سەکسەفۆنێ دەنگی له خۆیدا خنکابێ.
له دوای ئەم کۆچە سرمدییە
له دوای کۆچی خۆڵەمێشیی جەستە
ڕۆحی هەر مرۆڤێ.. ڕۆحی هەریەکێکمان.. ئەگۆڕدرێ بە شتێ
ڕۆحی جەلادێ.. پیاوکوژێ.. سەدامێ
ئەبێ بە مارو ڕۆحی قوربانیەکانی ئەبنە پەپوولەی هەوارێ.
ڕۆحی مەرگەوەرێ ئەبێ بە چقڵ و درکەزیو
ڕۆحی مەم و زینێ ئەبنە دوو گوڵی پێکەوەنووساوی
سەر دارێ. ڕۆحی (باریق)ێ ئەبێ بە دووپشکێ و
ڕۆحی کچە ئەنفال کراوێ ئەبێ بە کانیی چاوقرژاڵێ و
ڕۆحی فاشیستە تازەکانی ناو پەرلەمانی ئیستەی عێراقیش
ئەبن بە ڕیزی پێڵاوی ناو شەنگارێ. ڕۆحی (پ.م)ێ
ئەبێ بە قەڵبەزەی کەژێ و ڕۆحی کیمیاویەکەی هەڵەبجەیش
ئەبێتە کڵۆ ژەهرێ و ڕۆحی خاڵە تایەرێ و عەلی مەردانێ و
شەماڵ سائیبێ.. ئەبنە سێ هەلاڵەی ناو قژی شۆڕەژنانێ.
له دوای ئەم کۆچە ئەبەدییە
ڕۆحی حەمە جەزایش

ئەبێ بە هوزارێ
لە باخچەکەی سەی عەلی ئەسغەرداو
یان ئەبێ بە گیتارێ
بە دەست کچێکی جوانی سلەیمانییەوەو
یاخود ئەبێ بە شمشاڵێ
بە لالێوی شوانێکی ئێزدییەوە.
یاخود ئەبێ بە شەپۆلێکی ئەو ئاوەی
بۆ یەکەم جار لە دیجلەوە دێتە خوارێ.
حەمە جەزا ئەگەڕێتەوە.. ئەو دێتەوە
هەموو ساڵێ لەگەڵ کردنەوەی مەکتەبا ئەو دێتەوە
ئەبێ بە قەڵەمی ناو پەنجە بچکۆلەکانی
ئەو قوتابییە هەژارەی
کە یەکەم حەرف ئەنووسێ!.
هەموو ساڵێ ئەو دێتەوەو
ئەبێ بە هاواری ڕاچڵەکیوی ژنێ
کە پێکەوە عەقڵی کۆن و خورافات و
عەباو پەچەو نایەکسانی لە شەقامی گەورەی شاردا
ئەسووتێنێ.



هەموو ڕۆژێ ئەو لامانە
بەبێ ئەوەی خۆی ببینن
دەنگی زوولاڵی ئەبینن
بۆنی خۆشی بەستەکانیو
سەرووی مەقامی ئەبینن
کاکی پێشمەرگەی ئەبینن
بەبێ جەستەی.. بەبێ ئەوەی خۆی ببینن
نەوەرەسی ڕۆحی ئەبینن.. لەسەر ئەزمڕ
باڵ لێك ئەداو لە پرێکدا زۆر بە نزمی
دێتەوە بۆ سلەیمانی!
حەمە جەزا
پیاوێك لە شاخی گوێژە
شاخی گوێژ لە دەنگی خۆشو
دەنگی خۆش لە خوداوەو
خودا لە جوانیو
جوانییش لە ئێوەو
لە شیعرو
لە دەنگی ئازا!

سلێمانی
2010/10/23

# سەرجەمی کارو بەرهەمەکانی شاعیر
# بەپێی ساڵی یەکەم چاپیان

| | | | |
|---|---|---|---|
| 1 | تریفەی هەڵبەست | شیعر | 1968 |
| 2 | کەژاوەی گریان | شیعر | 1969 |
| 3 | کاوەی ئاسنگەر | شانۆنامەی شیعر | 1971 |
| 4 | من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ | شیعر | 1973 |
| 5 | ئاسك | شانۆنامەی شیعر | 1976 |
| 6 | کازیوە | پۆستەرە شیعر | 1978 |
| 7 | دوو سروودی کێوی | شیعری درێژ | 1980 |
| 8 | پرەمێردو زەریا | رۆمان – وەرگێران | 1982 |
| 9 | ڕوبار | چیرۆکە شیعر | 1983 |
| 10 | کەشکۆڵی پێشمەرگە | شیعری موقاوەمەت2 بەرگ/شاخ | 1984-1985 |
| 11 | دەستانی هەڵۆی سوور | قەسیدەی درێژ/ شاخ | 1985 |
| 12 | ئاوێنە بچکۆڵەکان | کورتە شیعر/ شاخ | 1986 |
| 13 | ئەمتوومان | شیعری درێژ | 1988-1989 |
| 14 | دەربەندی پەپوولە | شیعری درێژ | 1991 |
| 15 | ئافات | شیعر | 1993 |
| 16 | مێرگی زام مێرگی هەتاو | شیعر | 1996 |
| 17 | خاچو مارو رۆژژمێری شاعیرێ | رۆمانە شیعر | 1998 |
| 18 | بۆننامە | قەسیدەی درێژ | 1998 |
| 19 | چراکانی سەر هەڵەموت | پەخشان | 1999 |
| 20 | نسێ | شیعر | 1999 |
| 21 | ژنێكو دووپیاو | رۆمان- وەرگێران | 2000 |
| 22 | ژنو باران | شیعر | 2000 |
| 23 | رەنگدان | قەسیدەی درێژ | 2001 |
| 24 | ئەزموون | هەڤڤەیڤین ئا: یاسین عومەر | 2001 |
| 25 | لەچلەی چل چرایەکدا | پەخشانە شیعر | 2001 |
| 26 | پیاوێ لەدار سێو | شیعر | 2002 |
| 27 | خۆم ئەو وەختەی باڵندەم | شیعر | 2002 |
| 28 | پاییزە میوان | شیعر | 2002 |
| 29 | کوکوختیە بزێوەکە | چیرۆك بۆ منداڵان | 2003 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 30 | گۆرستانی چراکان | رۆمانە شیعر | 2004 |
| 31 | ئێوە بەخۆشەویستیم نەسپێرن | شیعر | 2004 |
| 32 | سرووده بەردینەکان | دەقی والا | 2005 |
| 33 | کورسی | دەقی والا | 2005 |
| 34 | لەگوڵەوە هەتا سوتوو | شیعر | 2006 |
| 35 | حەفتا پەنجەرەی گەرۆك | شیعر | 2007 |
| 36 | ملوانکە | دەقی والا | 2007 |
| 37 | تۆ نەتوانی بەقومێ ماچ بمخەیتەوە هەڵقوڵین | شیعر | 2007 |
| 38 | زێو زنە | شیعر | 2008 |
| 39 | تەون | شیعرو پەخشان | 2009 |
| 40 | هەستو نەست | شیعرو پەخشان | 2010 |

**تێبینی: ئەوەی جێگەی سەرنجە سەرجەم ئەم دیوانانە لەهەشت بەرگی گەورەدا کۆکراونەتەوە، جگە لەم دوایین دیوانە واتە (هەســتو نەست) نەبێت.**



ئەوەندە زۆر
لەو کاتینە وردبوومەوە
هەتا بوومەوە بە منداڵ!

شێرکۆ بێکەس
سلێمانی
ئەیلول / ٢٠١٠



تارام Designer

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سلێمانی 2010